

# چەند گوڵێك لە
# گوڵزاری ئیسلام

پێشکەشە بە گەنجی نەونەمام



دانانی
عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

چەند باسێکی تێدا زیاد کراوە

چاپی چوارەم



# چەند گوڵێك لە

# ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾

## پێشکەش بە

## گەنجی نەونەمام

دانانی

## عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

**چاپی چوارەم**

ذی القعدة-١٤٣١ی کۆچی

گەلارێزان-٢٧١٠ی کوردی

تشرین الثانی-٢٠١٠ی زایینی

ژمارەی سپاردن (٩٣٥) ساڵی (٢٠٠٧) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان پێ دراوە

ناوی پەرتووك: چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾.

دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.

نۆبەتی چاپ: چوارەم.

بەرواری چاپ: (١٤٣١) کۆچی-(٢٧١٠) کوردی-(٢٠١٠) زایینی.

تیراژ: (٣٠٠٠) دانە.

ژمارەی مۆبایلی بلاوکار: 07503471193

چاپخانە :رۆژهەلات - هەولێر

---

چاپی یەکەم: (٢٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی کریستاڵ، هەولێر.

چاپی دووەم: (١٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشەنبیری، هەولێر.

چاپی سێیەم: (٢٠٠٠) دانە، لە چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.

---

**دانراوەکانی تری دانەر:**

١-هۆنراوەی ئیمان و ئیسلام.

٢-ڕوونکردنەوەی (الأربعین النواویة).

٣-ڕوونکردنەوەی (العقیدة الطحاویة).

٤-ڕوونکردنەوەی (متن فتح القریب).

٥-ڕوونکردنەوەی (قطر العارِض فی علم الفرائض).

٦-ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین).

٧-عەقیدەی ئیسلامی لە سەر ڕارەوی(أهل السنة والجماعة).

٨-چۆنیەتی حەج و عومرە.

٩-مێرگ و گوڵزاری بەهار * ژیانی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

# پیشەکی

اَلْحَمْدُ للّه نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ به مِنْ شُرُور أَنْفُسنا، مَنْ يَهْدِاللهُ فَلاَ مُضلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هاديَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَإلَهَ إلاَّاللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذى خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَة وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِساَءً وَاتَّقُوااللهَ الَّذى تَسَاءَلُونَ به وَالأَرْحَامَ إنَّ اللهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً.

يَا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوااللهَ حَقَّ تُقَاته وَلا تَمُوتُنَّ إلاَ وَأَنْتُمْ مُسْلمُونَ.

يَا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوااللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً.

اَللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبارِكْ عَلى سَيِّدنا مُحَمَّد عَبْدكَ وَرَسُولكَ، وَعَلى آله وَصَحْبه، كَمَا صَلَّيْتَ عَلى إبْراهيمَ وآلِ إبْراهيم فىالْعَالَمين، إنَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ.

رَبَّنا اغْفِرْ لَنا وَلإخْوانِنَا الَّذينَ سَبَقُونا بالإيمان وَلاَ تَجْعَلْ فى قُلُوبنا غلاًّ للَّذينَ آمَنُوا رَبَّنا إنَّكَ رَؤُوفٌ رَحيمٌ. اَللَّهُمَّ ارْضَ عَنِ الصَّحابَة والتَّابعينَ وَتابعيهِمْ بِإحْسَانٍ، وَعَنْ جَميع أَئمَّة وَعُلَماءِ الدِّين مِنْ أَهْلِ السُّنة وَالْجَماعَة إلى يَوْمِ الدِّين.

**ئەی لاوی موسوڵمانی بەڕێز: السلام عليك ورحمة الله وبركاتە،**

**خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: ﴿ وَلا تَكُونُوا كَالَّذينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ ئێوە–ئەی موسوڵمانان– وەکو ئەو جولەکەو گاورانە مەبن: کە پەرتەوازە بوون و لە ئاییندا لێك جیابونەوە، لە دوای ئەوەی بەڵگەی ئاشکرایان لە لای خوداوە بۆ هاتبو: کە پەرتەوازەیی خراپەو یەکریزی باشە، ئەو پەرتەوازەچیانە سزایەکی گەورەیان هەیە لە ڕۆژی دوایی دا.**

**ئەی لاوی موسوڵمان: شتێکی ئاشکرایە: دەردی پەرتەوازەو لێکجیابوونەوە موسوڵمانەکانی کوردستانی پارچەکراویشی گرتۆتەوە–بە تایبەتی چینی لاوە خۆشەویستەکان– هۆی ئەم پەرتەوازەیەش ئەگەڕێتەوە سەر چەند (بانگەوازکارێك)ی (البدعة والضلالة): کە سەریان لە خەڵك شێواندوەو گەنجەکانیان کردونەتە دوژمنی یەکترو لە ڕێبازی (أهل السنة والجماعة) لایانداون و بە ناوی ئیسلام بۆ دژایەتی موسوڵمانان پەروەردەیان ئەکەن.**

**(حُذَيْفَة‌ﷺ) لەم بابەتە پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کردو گوتی: ﴿ فَهَلْ بَعْدَ ذَلكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قالَ: نَعَمْ، دُعاةٌ عَلَى أَبْوابِ جَهَنَّمَ مَنْ أَجابَهُمْ إلَيْهاَ قَذَفُوهُ فيها...﴾ الحديث رواه البخاري ومسلم، ئایا لە دوا ی ئەو چاکەیە خراپەیەکی تر ئەبێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، کۆمەڵە (بانگەوازکارێك) لە سەر دەرگەی دۆزەخن، هەر کەسێك بەدەم بانگەوازەکەیانەوە بچێ، فڕێی ئەدەنە ناو دۆزەخ...**

بەڵێ: ئەی لاوی موسوڵمان: ئێستا خراپەی ئەم (بانگەوازکارانە) گەیشتۆتە ئەم پلەیە: جنێو بە پێشەوایانی ئایینی ئەدەنو بە گومڕایان دائەنێن، لەم سنوورەش نەوەستان، بەڵکو جنێو بە دایكو باوكی پێغەمبەرﷺ ئەدەنو دەڵێن: كافرن!!!، منیش ناچار بووم بەرگری لە پێشەوایانی ئاینی بكەم-بە تایبەتی هەر چوار ئیمامەكانی سەرمەزهەب- چونكە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿ إذَا لَعَنَ آخرُ هذه الأُمَّة أَوَّلَها، فَمَنْ كَتَمَ حَديثاً فَقَدْ كَتَمَ ما أَنْزَلَ اللهُ ﴾ أخرجه إبن ماجه وإبن عساكر، هەركاتێك دواینی ئۆممەتم لەعنەتی كردە سەرەتای ئۆممەتم، هەركەسێك فەرموودەیەكی من بشارێتەوەو بڵاوی نەكاتەوە، تاوانی وەك ئەو تاوانەیە: كە قورئان بشارێتەوەو بڵاوی نەكاتەوە.

ئەی لاوی موسوڵمان-إن شاء الله- لەم پەڕتوكەدا ئەم (بانگەوازكارانە)و پیشەی ئەم (بانگەوازكارانە) بە بەڕێزت ئەناسێنمو ڕاستیت بۆ ڕوون ئەكەمەوە، بەم شێوەیە: چەند دەردێكی (أهل البدعة) باس ئەكەینو چەند دەرمانێك لە دەرمانخانەی (أهل السنة) پێشكەش بە جەنابت ئەكەین، بەم ئاماژەیە: (ل) واتە: لاپەڕە، (ب) واتە: بەرگ، جا-إن شاءالله- كە خوێندتەوە، هەست ئەكەی: لە گوڵزارێكدا گوڵچنین ئەكەی، بۆیێ ناوم لێنا:

**( چەند گوڵێك لە گوڵزاری ئیسلام، پێشكەش بە گەنجی نەونەمام ).**

ئەی لاوی موسوڵمان: كاتێك ئەبینی ڕەددی(أهل البدعة) ئەدەمەوە، وا تێمەگە: مەبەستم جنێودانە، خوا دەزانێ مەبەستم بەرگریكردنە لە پێشەوایانی ئایین، جا ئەگەر باوەڕ ناكەیو ئەم ڕەددانەوەیە هەر بە جنێودان تێئەگەی، ئەو مافەم لە دەست مەدە: كە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿ اَلْمُسْتَبّان ما قالا فَعَلَى الْبادئ مِنْهُما مالَمْ يَعْتَد الْمَظلُوُم ﴾ رواه مسلم، هەردوو جنێودەرەكان هەرچی بڵێن، تاوانەكەی لە سەر دەستپێشخەرەكەیە، بەو مەرجەی ستەملێكراوە لە سنوور دەرنەچێ. كەوابو: ئەگەر هەر بەناهەقم تێئەگەی، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە دەڵێم: (اَلْبادئُ هُوَالأَظْلَمُ) دەستپێشخەر ستەمكارترە.

بەڵێ ئەو بانگەوازكارانەی (البدعة) ئاژاوەیان دروست كردو-جگە لە خۆیان- گشت خەڵكیان بە گومڕا داناوە، چونكە شوێنكەوتەی ئەم چوار مەزهەبەنە.

ئیتر لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە: یارمەتیم بدا، بۆ تەواوكردنی ئەم پەڕتوكەو لە سەر ڕێگەی ڕاستی (أهل السنة) بمانهێڵێتەوە، (وحسبنا الله ونعم الوكيل ولاحول ولاقوة إلا بالله العلي العظيم).

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

شوال (١٤١٧) كۆچی

هەولێر - كوردستان

## ﴿ دەرد و دەرمان ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ئامۆژگاری (صحابة)کانی کردو فەمووی: ﴿ وَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرى اخْتِلافاً كَثِيراً فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفـاءِ الرَّاشِـدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْها بِالنَّواجِذِ، وَإِيّاكُمْ وَمُحْدَثاتِ الأُمُورِ، فإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ ﴾ رواه أبوداود والترمذي وقال حسن صحيح، هەر یەکێك لە ئێوە بژیێ، پەرتەوازەو کێشەیەکی زۆر ئەبینێ، لە کاتی پەرتەوازەدا ئێوە دەست بە ڕەوشتی منو هەر چوار خەلیفەکانی منەوە بگرن-کە (أبوبكر)و (عمر)و (عثمان)و (علي)ن، رضي الله عنهم- ئەو چوارانە لە سەر ڕێگەی منو شارەزای ڕێگەی ڕاستن، ئاگاداری خۆتان بن: لەو جۆرە شتانەی لە ئاییندا پەیدا دەکرێن، چونکە گشت پەیداکراوێکی بێشەرعی گومڕایی یە.

لە حەدیسێکی تردا پێغەمبەرﷺ ئەندازەی ئەم پەرتەوازەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو هەمان دەرمانیشی بۆ دائەنێو ئەفەرموێ: ﴿ تَفْتَرِقُ هذهِ الأُمَّةُ عَلى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً كُلُّهـا فِي النّارِ إِلاَّ واحِدَةً: وَهِيَ الْجَماعَةُ ﴾ وفي رواية: ﴿ ماهِيَ؟ قال: ما أَنا عَلَيْـهِ الْيَـوْمَ وَأَصْحابِي ﴾ سنده صحيح رواه ابوداود والترمذي والحاكم، ئەم ئوممەتەی ئیسلام پەرتەوازە ئەبێو ئەبێتە حەفتاو سێ گرۆه، گشتیان گومڕانەو ئەچنە دۆزەخ، تەنها یەکێکیان نەبێ: کە کۆمەڵە، ئەو کۆمەڵەی لە سەر ڕێبازی ئێستای منو (صحابة)کانی منە، واتە (أهل السنة والجماعة).

لەم حەدیسەدا ئاشکرا بوو: کە حەفتاو دوو گرۆه لەم حەفتاو سێیانە گشتیان (أهل البدعة والضلالة)ن، هەروەها لە ووشەی (هذِهِ الأُمَّة) دەردەکەوێ: کە ئەم حەفتاو دوو گرۆهە گومڕابووانە، گشتی گرۆهی ئایینیو ئوممەتی پێغەمبەرنﷺ، نەك گرۆهەکانی(علماني)؟ چونکە (علمانية) دروستکراوی کافرەکانی ڕۆژئاوایەو لەوانەوە هاتۆتە ناو موسوڵمانان، بۆیێ گرۆهەکانی(علماني) باوەڕیان بە (حُكْم)ی ئیسلام نیەو دژی ڕێبازی پێغەمبەرنﷺ، هەم بە ناوی ئایین گرۆهەکەی خۆیان پێك ناهێنن.

هەروەها مەبەست بە ڕستەی (كُلُّها فِي النّارِ) ئەمەیە: ئەم حەفتاودوو گرۆهە بە هۆی (ضلالة)=گومڕایی ئەچنە دۆزەخ، نەك بە هۆی (كُفْر)، کەوابوو: (أهل البدعة) موسوڵمانن، بە یەکجاری لە دۆزەخدا نامێننەوە-والله أعلم- .

## ﴿ باشترین دەرمانخانە ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: تاکو هیچ کەسێك نەتوانێ ڕێبازی پێغەمبەروﷺ هەرچوار خەلیفەکانو (صحابة)کانی تری پێغەمبەرتﷺ لێ گوم بکاو نەتوانێ بتخاتە ناو دەردی گومڕایی، ئەوە پێغەمبەرﷺ باشترین دەرمانخانەی بۆ داناویو ئەفەرموێ:

﴿ خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّـذِينَ يَلُـونَهُمْ ﴾ رواه البخاري ومسلم، باشترینی ئوممەتم ئەم سەدەی خۆمە، ئینجا سەدەی دوای ئەوان، ئینجا سەدەی دوای ئەوان. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٤١٩) ب(٩).

لەم حەدیسەدا دەرکەوت: کە زانایانی ئەم سێ سەدەیە-واتە: تا کۆتایی سالّی سێسەدی کۆچی- جێگەی متمانەو باوەڕن بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی پێغەمبەرﷺ هەر چوار خەلیفەکان، چونکە پێغەمبەرﷺ بە ووشەی (خَيْرُ أُمَّتِي) شاهیدی بۆ داون، کەوابوو: ئەو زانا بەڕێزانەی ئەم سێسەد سالّە-کە هەلّگری بڕوانامەی پێغەمبەرنﷺ- ئەوانو هەر ئەوان شیاوی ئەوەن: ئێمە شوێنکەوتەیان بین، نەك فەریکە خوێندەوارێکی ئەم سەردەمەی ئێستامان، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ئەفەرموێ:﴿ إِنَّ أَوَّلَ هَـذِهِ الْأُمَّةِ خِيَارُهُمْ وَآخِرُهَا شِرَارُهُمْ مُخْتَلِفِينَ مُتَفَرِّقِينَ ﴾ رواه الطبراني في الكبير بإسناد حسن، بە ڕاستی سەرەتای ئەم ئوممەتەم باشترینەکانن، کۆتاییەکەشی خراپترینەکانن، ناکۆكو پەرەتەوازەن. کەوابوو: ئەگەر ئێمەش شوێنیان کەوین، هەر پەرتەوازەیان لێ فێر دەبین، نەك یەکریزیو ڕێزلێنان.

## ﴿ السَّلَفُ الصَّالِحْ= پێشینە باشەکان ﴾

هەر بە بەلّگەی ئەم دووحەدیسە: بە زانایانی ئەم سێسەد سالّە ئەگوترێ: (السَّلَفُ الصَّالِح)، واتە: پێشینە باشەکان، کەوابوو: ئەگەر تا ئێستا عەودالّی ڕاستەقینە بووی، ئەوە- سوپاس بۆ خوا- ڕاستیت بۆ دەرکەوت، تکات لێ دەکەم زۆر وریابە: نەوەك بانگەوازکارانی (البدعة والضلالة) لە ناو بەرگی (أهل السُّنَّة وَالْجَمَاعَة)دا، بێنە سەر ڕێگەتو لە ڕاڕەوی (السَّلَف الصَّالِح) دوورت خەنەوەو بتکەنە دوژمنی زانایانی ئیسلام، کەوابوو: ووشەی (خَيْرُ أُمَّتِي) بەردەوام لە بەر چاوت بێو لە ڕێبازی زانایانی ئەو سێسەد سالّە لامەدە.

## ﴿ زنجیرەی زانستی هە رچوار پێشەوایەکانی سەر مەزهەب رضي الله عنهم﴾

ئەی لاوی موسولّمان: زنجیرەی زانستی ئایین هەر لە خۆی دا بەشێکە لە ئایین، هەروەك ئیمام (محمد بن سیرین) دەفەرموێ: (إِنَّ هذا الْعِلْمَ دِينٌ فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ) رواه مسلم، واتە: ئەم زانستە ئایینی ئێوەیە، کەواتە: باش تەماشا بکەن: ئایینی خۆتان لەکێ وەردەگرن؟.

جا ئەی لاوی موسولّمان: بە (إِجْمَاع)=یەکدەنگی زانایانی هەرسێك سەدەی (السَّلَف الصَّالِح): باوەڕو متمانە بە زانستو پێشەوایەتی چوار زانای (السلف) کراوەو هەر یەکەشیان بە پێشەوای یەکێك لە چوار مەزهەبەکەی (أهل السنة) داندراوە، ئەم چوار بەڕێزانەش: ئیمامی (حنفی=أبوحنیفە)و ئیمام (مالك)و ئیمامی (الشافعي)و ئیمام

(أحمد)=حنبلی رضی الله عنهم، جا له بەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿ اَلْعُلَماءُ وَرَثَةُ الْأَنْبِياءِ ﴾ رواه أبوداود، زانایانی ئایین میراتگری پێغەمبەرانن. ئەوا ئێمەش کورتە پێناسەیەك‌و زینجیرەی زانستی ئەم چوار ئیمامە بەڕێزانە پێشکەش بە جەنابت دەکەین، تاکو بزانی چۆن ئەم زانستەیان بە میرات لە پێغەمبەرﷺ وەرگرتوە:

## ١-﴿ زنجیرەی زانستی ئیمام ( أبوحنیفه )ﷺ ﴾

ئیمامی (حنفی=أبوحنیفة)ﷺ ناوی (نعمان)ی کوڕی (ثابت)ی (کوفي)یە، بەڵام لە بنچینەدا باپیرەی ئیمامی (حنفی) خەڵکی شاری (کابل)ە لە (أفغانستان)، باوك‌و باپیرەی ئیمامی (حنفی) هەردووکیان بە موسوڵمانی-لە (کوفة)- بە خزمەت ئیمامی(علی) گەیشتون، بڕوانە کتێبی (منازل الأئمة الأربعة) ل(٧٨).

ئیمامی (حنفی) لە ساڵی (٨٠)ی کۆچی لە شاری (کوفة) لە دایك بووە، لەساڵی (١٥٠)ی کۆچی لە شاری (بغداد) وەفاتی کردوە، کەواتە: ئەم بەڕێزە بە زانایەکی (السَّلَفْ) دەناسرێ؟ چونکە لە سەدەی یەکەم‌و دووەمی (السلف الصالح)دا ژیاوەو حەدیسەکەی ﴿ خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي... ﴾ دەیگرێتەوە.

جگە لەمەش: ئیمامی (حنفی ) لە چینی (التابعین) دەژمێردرێ؟ چونکە گەیشتۆتە سێ-تا-شەش (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ کە یەکێکیان حەزرەتی (أنس بن مالكﷺ) بوو. بڕوانە (المعلومات النافعة) ل(٣٨) و (نور الابصار) ل(٢٠٥).

زنجیرەی زانستی ئیمامی (حنفی ) لە ڕێگەی حەزرەتی (عبدالله بن مسعودﷺ) دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، چونکە ئیمامی (حنفی) لە لای (حماد) خوێندویەتی، ئەویش لە لای (إبراهیم النخعي)، ئەویش لە لای (علقمة)، ئەویش لە لای حەزرەتی (عبدالله بن مسعودﷺ) کە (صحابة)یەکی بەڕێزی پێغەمبەرەﷺ. بڕوانە(تأریخ التشریعي الإسلامي) ل(٣٠٣).

ئیمامی(حنفی) دەرسی داوەتە ئیمام (عبدالله بن المبارك)و ئیمام (مالك)و ئیمام (محمد)و ئیمام (أبي یوسف)، واتە: ئەم بەڕێزانەو چەندانی تریش قوتابی ئیمامی (حنفی) بوون. بڕوانە (المعلومات النافعة) ل(١٣٥).

ئیمامی (حنفی) پیاوێکی خواناس‌و ئایین پەروەر بوو، هەردەم لە خواپەرستی دا بوو، بە شێوەیەکی وەها: ماوەی چل ساڵ بە دەستنوێژی عیشاوە نوێژی بەیانی کردوە. خوا لێ ی ڕازی بێ، آمین. بڕوانە (نور الأبصار) ل(٢٠٦).

## ﴿ دژایەتی ( ألبانی ) لەگەڵ ئیمامی ( حنفیﷺ )﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: لەم چەند دێڕەی ڕابردوودا بۆت ئاشکرا بوو: ئیمامی(حنفی) کام زانای بەڕێزە، گومانم نیە: ڕێزو حوڕمەتی ئەم بەڕێزە لە ناو دڵی گشت موسوڵمانێکی

لەخواترسـدا جـێی ئەبێتـەوە، بـەڵام ئـەوەی جێگـەی داخ و سەرسـوڕمانە، ئەوەیـە: کە پێشەوایەکی (خَوارِج)ی ئەم سەردەمە-بـۆ خزمـەتی (کُفر)- لـە پلـەی ئـەم ئیمامـە بەڕێزە کەم ئەکاتەوەو هەوڵ ئەدا: گومان بخاتە ناو دڵی لاوەکـانی ئیـسلام بـۆ تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان، بفەرموو بە چاوی خۆت ببینـە: (ألبـانی) بەرامبـەر ئیمـامی(حنفـی) چی دەڵێ؟!:

لە پەراوێزی حەدیسی ژمارە (٢٠٦٠)ی (مختصر صحيح مسلم)دا، باسی(نزول عیسی)عليه الصلاة والسلام- دەڵێ: (هذا صريح فـي أنّ عيـسى-عليه السلام- يحكـم بـشرعنا ويقـضي بالكتـاب والـسنة لابغيرها من الإنجيل أو الفقه الحنفي ونحوه). بڕوانە (مختصر صحيح مسلم) ل(٥٤٨) الطبعة السادسة، واتە: ئەم حەدیسە ئاشکرایە لەوەدا: کە (عیسی)-عليه السلام- (حُکم) بە شەرعی ئێمە ئەکاو بڕیار بە قوڕئان و حەدیس دەردەکا، جگە لـەم دووانـە بـە شـتێکی تـر ڕەفتـار ناکـا: وەکو (إنجیل)و مەزهەبی (حنفی)و مەزهەبەکانی تری وەك مەزهەبی (حنفی).

ئەی لاوی موسڵمان، وا بە چاوی خۆت دەبینی: ئەم گۆتە ترسناکە چەند بێئەدەبەو چەند خزمەتی کوفر دەکاو ڕێگە ئاسان دەکـا: تـاکو دوژمنـانی ئیـسلام گومـان بێخنـە نـاو دڵـی لاوەکانمان و متمانەو باوەڕیان نەمێنێ بەرامبەر مەزهەبی ئیمامێکی (الـسلف الـصالح): کـە لە چینی (التابعین) دەژمێردرێ، ئایا هیچ موسوڵمانێکی لەخواترس بەوە باوەڕ دەکـا: کـە مەزهەبی (حنفی) وەکو (إنجیل) دژ بە ئیسلام بێ!!!؟ واتە: ئەم گۆتەیە بە ئاشکرا لێ ی دەفامێتەوە: کە شوێنکەوتەکانی ئیمامی(حنفی) وەکو گاورەکـانی شـوێنکەوتەی (إنجیـل) گومڕابن!!!، (سُبْحانَكَ-اللَّهُمَّ- هذا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ).

ئایا ئیمامی (حنفی) بە مەزهەبی خۆی-کە لە قوڕئان و حەدیس وەری گرتوە- خزمەتی ئیسلامی کردوە، یان -وەکو (ألبانی)- بۆ بەرژەوەندی کـوفر ڕیـزی موسـوڵمانانی تێـك داوەو موسوڵمانی خستونەتە گومان لە ئاینی ئیسلام؟.

باشە: ئەوە زنجیرەی زانستی ئیمامی(حنفـی) بـە چـوار ئەلقـە دەگاتـەوە پێغەمبـەرﷺ، ئاشکراشە: پێویستە زانستی ئـایینی ئیـسلام-بـە زنجیـرە لـە ڕێگـەی پێغەمبـەرەوەﷺ، ئینجا لە ڕێگەی زانایانی(سَلَف)، ئینجا لە ڕێگەی زانایانی(خَلَف) بگاتـە ئێمـە، کـەوابوو: دەپرسین: ئایا (ألبانی) لە لای کێ خوێندویەتی؟ ئایـا زانـستی (ألبـانی) لـە ئاسمانـەوە بۆی هاتۆتە خوارەوە، یان لە زەمین بۆی هەڵقوڵاوە؟ بەڵێ: ئەوە حەدیسەکەی﴿ خَيْـــرُ أُمَّتِي قَرْنِي...﴾ ئیمامی(حنفی) دەگرێـەوە، بەڵام: هەی (ألبانی)، کام حەدیس جـەنابت دەگرێتەوە؟ مەگەر حەدیـسەکەی﴿ شِرارُ أُمَّتِي آخِرُهـــا ﴾، چونکە جـەنابت ئێـستا وا لە سەدەی پانزەهەمی کۆچی دا دەژێی و تێکدەری ڕیزی موسوڵمانانی!!!.

ئـەی لاوی موسـوڵمان: جـەنابت خـۆت بڕیـار بـدە: ئایـا (ألبـانی) شـیاوی ئەوەیـە: ئێمە شـوێنکەوتەی بـین‌و تـەنها پەرتـەوازەو تێکدانی ڕیـزی موسـوڵمانانی لێ فێـرببین‌و واز لە زانایانی(السلف) بهێنین؟.

کەسێك ئەم جۆرە تۆمەتانە بداتە پاڵ زانانی(سَلَف)، چۆن دروستە باوەڕی پێبکەین کە دەڵـێ: ئـەم حەدیـسە (ضـعیف)ە؟ ئایـا ڕاسـتە: کـە شـوێنکەوتەکانی (ألبـانی) بە دەمارگیریەوە دەڵێن: (ألبانی) حەدیسگێرەوە=(مُحَدِّث)ی ئەم سەردەمەیە؟ ئایا ئەوە ڕاستە، یان (ألبانی)-بە ڕاستی- (مُحْدِث)ی ئێم سەردەمەیە!!!؟.

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئـەبینی هـەر گـەنجێك هەڵخەڵـەتاو بـێ‌و شـوێن گۆتـەی (ألبـانی) کـەوتبێ، زمـانی زۆ بێئەدەبـە بەرامبـەر زانایـانی ئیـسلام، بەردەوام-وەکو پێشەوایەکەی خۆی- هەر خەریکی ئاژاوەو تێکدانی ڕیزی موسوڵمانانە، خوا بمانپارێزێ، آمین.

## ٢-﴿ ئیمام (مالك رضي الله عنه) ﴾

ئەم بەڕێزە ناوی (مالك) کوڕی (أنس) کوڕی (مالك) کوڕی (أبیعامرالأصبحي)یە رضي الله عنه، ئـەم (أبوعامر)ە (صحابة)ی پێغەمبەرە ﷺ، هەروەها (أنس)ش کە باوکیەتی (تابعین)ە، ئیمام مالك لە ساڵی (٩٣)ی کۆچی لە (مدینە)ی پیرۆز لە دایك بووە، لە ساڵی (١٧٩)ی کۆچـی هـەر لـە (مدینـة) وەفـاتی کـردوە، کەواتـە: ئـەم بـەڕێزەش بـە زانایـەکی (الـسلف) دەناسـرێ، چـونکە لـە سـەدەی یەکـەم‌و دووەمـی (الـسلف)دا ژیـاوەو حەدیـسەکەی ﴿ خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي... ﴾ دەیگرێتەوە.

زنجیرەی زانستی ئیمامی (مالك): لە لایەك لە ڕێگەی حەزرەتی (عبـدالله بـن مـسعود رضي الله عنه) دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ-هەروەك باسمان کرد: کە لـە لای ئیمـامی(حنفـی)ی خوێنـدوە- لە لایەکی تریش: لە ڕێگەی حەزرەتی (زید بن ثابت رضي الله عنه)، چـونکە ئیمـام (مالـك ) لـە لای (الزهری) خوێندویەتی، ئەویش لە لای (سعید بن المُسیِّب)، ئەویش لە لای حەزرەتی (زید بن ثابـت رضي الله عنه)، ئـەویش (صـحابە)ی پێغەمبـەرەو ﷺ، مامۆسـتای دانیـشتووانی (مدینـة)ی پیرۆزە، بڕوانە (نور الابصار) ل(٢٠٨) و(تأريخ التشريع الإسلامي) ل(٣٠٢)و(٣١٨).

ئیمام (مالك ) لە لای نۆسەد مامۆستای خوێندوەو بە دەستی خۆی سەد هەزار حەدیسی نوسیوەتەوە، لە تەمەنی حەڤدە ساڵی دا دەسـتی بـە دەرس گوتنـەوە کـردوەو حـەفتا مامۆستا شاهیدی بۆداوە: کە شیاوی دەرس گوتنەوەیە، کتێبی (المُوَطّأ)ی لە حەدیـسی پێغەمبەر ﷺ داناوە. بڕوانە (المعلومات النافعة) ل (١٣٧).

## ٣-﴿ ئیمامی (الشافعی‌رحمه الله) ﴾

ئیمامی(شافعی ) ناوی (محمد) کوڕی (إدریس) کوڕی (العباس) کوڕی (عثمان) کوڕی (شافع) کوڕی (سائب) کوڕی (عبید) کوڕی (عبدیزید) کوڕی (هاشم) کوڕی (المُطَّلب) کوڕی (عبدمناف)ی (قُرَیْشي)یە، واتە: لە هۆزە بەڕێزەکەی پێغەمبەرەﷺو لە باپیرەی سێیەمی پێغەمبەرﷺ-کە (عبدمناف)ە- نەژادی دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، هەروەها دوو باپیرەی ئیمامی(شافعی): کە ( شافع)و (سائب)ن، هەردووکیان (صحابە)ی پێغەمبەرﷺ بوون.

ئیمامی(شافعی) لە ساڵی (١٥٠)ی کۆچی لە شاری(غَزَّة)- لە (فَلَسطِین)- لە دایك بووە، لە ساڵی (٢٠٤)ی کۆچی لە (مِصْر) وەفاتی کردوە، کەواتە: ئەم بەڕێزەش بە زانایەکی (السلف) دەناسرێ، چونکە لە سەدەی دووەمو سێیەمی (السلف)دا ژیاوەو حەدیسەکەی ﴿ خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ﴾ دەیگرێتەوە.

ئەم بەڕێزە لە تەمەنی حەفت ساڵی دا هەموو قورئانی لەبەر کردوە، لە تەمەنی دەساڵی دا (مُوَطَّأ)ی ئیمام (مالك)ی لەبەر کردوە، لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بڕوانامەی شەریعەتی ئیسلامی لە لای مامۆستای خۆی ئیمام (مسلم بن خالد الزنجی) وەرگرتوە، ئینجا لە هەمان ساڵدا بڕوانامەشی لە لای مامۆستای دووەمی خۆی ئیمام (مالك) وەرگرتوە، بڕوانە (نور الابصار) ل(٢١٢).

زنجیرەی زانستی ئیمامی (الشافعی) لە ڕێگەی حەزرەتی (عبدالله بن عباس رضی‌الله عنهما) دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، چونکە ئیمامی (الشافعی) لە لای ئیمام (مسلم بن خالدالزنجی)ی خوێندوە، ئەویش لە لای (عکرمة)و (مجاهد)، ئەوانەش لە لای حەزرەتی (إبن عباس رضی الله عنهما)-کە هەم (صحابة)و هەم کوڕە مامی پێغەمبەرەﷺ-. بڕوانە (تأریخ التشریع الاسلامی) ل(٣٠٣).

مامۆستا مەلا (عبدالکریم المدرس) فەرموویەتی: ئیمامی(الشافعی) هاتۆتە شاری (هەولێر)و دەوروبەری، ماوەی دوو ساڵان لەو هەرێمەدا گەڕاوەو لەگەڵ زانایانی ئایینی گفتوگۆی زانستی ی کردوەو مەزهەبی خۆی بڵاو کردۆتەوە، زانایەکانیش مەزهەبەکەیان قبوڵ کردوەو بە ڕاستیان داناوە، بۆیێ گەلی کورد لە سەر مەزهەبی ئیمامی(الشافعی)ن. -بڕوانە (جواهرالکلام فی عقاید أهل الإسلام) ل(١٩٦)- منیش دەڵێم: الحمد لله، کە گەلی کوردی موسوڵمان لە سەر مەزهەبی ئەم زانا نەژاد پاکەو ئەم خزمەی پێغەمبەرنﷺ.

## ٤-﴿ ئیمام (أحمد=حنبلی‌رحمه الله) ﴾

ئەم بەڕێزە ناوی (أحمد) کوڕی (حنبل)ی (الشیبانی)یە، لە ساڵی (١٦٤)ی کۆچی لە (بغداد) لە دایك بووە، لە ساڵی (٢٤١) کۆچی هەر لە (بغداد) وەفاتی کردوە، کەواتە: ئەم بەڕێزەش

به زانایەکی (السلف) دەناسرێ، چونکە لە سەدەی دووەمو سێیەمی (السلف)دا ژیاوەو حەدیسەکەی ﴿ خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ﴾ دەیگرێتەوە.

ئەم بەڕێزە دەرسی (فقە)ی لە لای ئیمامی (الشافعی) خوێندوەو دەرسیشی بە ئیمامی (البخاری)و (مسلم) گوتوە، لە هەمان کاتیشدا ئیمامی(الشافعی) دەرسی (حدیث)ی لە لای وی خوێندوە. بڕوانە (المعلومات النافعة) ل(١٤٠) و(تأریخ التشریع الاسلامی) ل(٣٢١).

ئیمام (أحمد) هەزار هەزار (حدیث)ی لەبەر بوو، بە حەفت ڕۆژان ختمێکی قورئانی دەخوێندو لە شەو و ڕۆژێکدا سێسەد ڕەکعەت نوێژی دەکرد، ئیمامی(الشافعی) دەفەرموێ: کە لە (بغداد) ڕۆیشتم، هیچ کەسێکی لەخواترسترو زاناتر لە (أحمد بن حنبل)م لە دوای خۆم بەجێ نەماوە. (نور الابصار) ل(٢٢٥)و (٢٢٧).

ئینجا بزانە: زنجیرەی زانستی ئیمام (أحمد) وەکو زنجیرەی زانستی ئیمامی(الشافعی) لە ڕێگەی حەزرەتی (عبدالله بن عباس)رضی الله عنهما دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، چونکە ئیمام (أحمد) لە لای ئیمامی(الشافعی) خوێندویەتی.

جا ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوا ئەم چوار ئیمامە بەڕێزانەت ناسین، بەڵام پێم بڵێ: ڕات چۆنە بەرامبەر ئەو فەریکە خوێندەوارەی دەڵێ: واز لەم چوار مەزهەبانە بێنەو وەرە شوێن من بکەوە؟!.

## ﴿ پیلانی کافرەکان بەرامبەر ئەم چوار مەزهەبە ﴾

پێشەکی ئەی لاوی موسوڵمان: لەو ڕۆژەوە کە خوای گەورە حەزرەتی(محمد)ی کردۆتە پێغەمبەری ئیسلامﷺ، کافرەکان بەردەوام لە پیلانو ئامادەباشیدان: بۆ لێدانی ئەم ئایینە پیرۆزە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا ﴾(البقرە: ٢١٧) واتە: کافرەکان هەر بەردەوام دەبن جەنگتان لەگەڵ دەکەن تا لە ئایینی ئیسلامتان وەردەگێڕن ئەگەر بتوانن.

بەڵێ: خوای گەورە دەفەرموێ: (ئەگەر بتوانن). ئەم ئەگەرە لە بەر ئەوەیە: خوای گەورە نیعمەتێکی وەها گەورەی داوەتە موسوڵمانان-کە ئایینی ئیسلامە- موسوڵمانان نایانەوێ ئەم نیعمەتە لە دەست خۆیان بدەن، بۆیێ ئەگەر شتێکیش دەربارەی ئایینی ئیسلام نەزانن، ڕوو دەکەنە لای زانای ئایینی تاکو لە دەردی نەزانی ڕزگار ببن، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ ﴾(النحل: ٤٣) واتە: ئێوە پرسیار لە زانایانی ئایین بکەن ئەگەر نازانن.

بەڵێ: ئەوە هەزارو دووسەد ساڵە موسوڵمانان ئایینی ئیسلام ئەنجام دەدەن بەگوێرەی تێگەیشتنی ئەم چوار مەزهەبانە لە قورئانو حەدیس، ئاشکرایە: کافرەکانیش زۆر باش

دەزانن: تا موسوڵمانان شارەزای ئاینی خۆیان بن، ئەوان هەوڵەکانیان پوچەڵ دەبێتەوە، بۆیێ ئەم جارە چەند پیلانێکی تریان بەکار هێنا بۆ لێدانی ئیسلام: ئەویش نەهێشتنی متمانەو باوەڕە بە زانایانی ئیسلام، داڕشتنی پیلانەکەش بەم شێوەی خوارەوەیە:
لە ساڵی (١٨٩٧)ز، جولەکەکان کۆنگرەیەکیان بەست لە (سویسرا) بە سەرۆکایەتی (تیودور هرتزل)ی جولەکەو بڕیاریان دا: دەوڵەتێك بۆ جووەکان دابمەزرێنن لە سەر خاکی (فلسطین)، بۆ ئەم کارەش (هرتزل) دیاری کرا: کە بچێتە لای سوڵتان (عبدالحمیدالثانی)ی (خلیفة)ی ئیسلامو گفتوگۆی لەگەڵ بکا. بڕوانە کتێبی (القدس المحتلة) ل(٣٣).
بەڵام کاتێك وەفدەکە چووە لای (خلیفة)ی ئیسلام–کە هەمان (عبدالحمیدالثانی) بوو– داوایان لێ کرد: پارچە زەویەکیان پێ بفرۆشێ لە خاکی (فلسطین). جا سوڵتان (عبدالحمید) بەم فەرموودە توندوتیژە وەڵامی جووەکانی دایەوە: (إِنَّ الْبِلادَ الَّتِي اُمْتُلِكَتْ بِالدِّماءِ لا تُباع إلاَّ بِنَفْسِ الثَّمَن.) واتە: بەڕاستی ئەو شارانەی بە خوێن وەرگیراون، تەنها بە خوێن نەبێ نافرۆشێن.
ئینجا لە ساڵی (١٩٠٢)ز، دووبارە وەفدێکی تریان بۆ هەمان مەبەست ناردەوە، دووبارە سوڵتان(عبدالحمیدالثانی) وەڵامی دانەوەو فەرمووی: (إِنَّ بَيْتَ الْمَقْدِسِ الشَّرِيفَ قَدْ افْتَتَحَهُ لِلإِسْلامِ سَيِّدُنا عُمَرُ بن الْخَطّابﷺ وَلَسْتُ مُسْتَعِدّاً لأنْ اَتَحَمَّلَ فِيالتَّأْرِيخ وَصَمْةَ بَيْعِها لِلْيَهُودِ وَخيانَةَ الأَمانَةِ الَّتِي كَلَّفَنِي الْمُسْلِمونَ بِحِمايَتِها.) بڕوانە پەڕتوکی (السلطان عبدالحمیدالثانی) ل(٣٣)و (٣٦).
لە هەندێك پەڕتوکی تردا هاتوە: (إِنَّ هذِهِ الأَرْضَ أَرْضُ الْمُسْلِمِينَ فَتَحُوها بِدِمائِهِمْ، وَلَنْ أُسَلِّمَ شِبْراً مِنْها إلاَّ عَلى أَشْلائِي.) واتە: ئەم خاکە پیرۆزەی ماڵی خوا لە (فلسطین)، یەکەم جار ئیمامی(عمرﷺ) بۆ ئیسلامی وەرگرتوە، من ئامادە نیم لە مێژوودا ڕووڕەشی فرشتنی ئەم خاکە بۆ جووەکان هەڵبگرم، ئامادە نیم خیانەت لەم ئەمانەتەدا بکەم: کە موسوڵمانان بە منیان سپاردوە تا بیپارێزم...ئەم خاکە خاکی موسوڵمانانە، بە خوێنی خۆیان ئازادیان کردوە، یەك بستی ئەم خاکە نادەمە هیچ کەسێك، مەگەر لە سەر لاشەی پارچەکراومدا وەری بگرن.
ئەی لاوی موسوڵمان: هەر ئەم سوڵتان (عبدالحمید)ە ئایین پەروەرە بوو لە دژی کافرە شەڕخوازەکانی ڕۆژئاوا، دروشمی (يـا مُسْلِمِي الْعـالَمِ اِتَّحِـدُوا)ی بەرزکردەوە، واتە: (هۆ موسوڵمانانی جیهان یەك گرن). بڕوانە (الامام أمجد الزهاوی) ل(٤٣و٧٧).
ئینجا هەر لە بەر ئەم هەڵوێستە ئیسلامی یە، جووەکانو حیزبی (الاتحاد والترقی)ی نۆکەری کافرەکانو چەند کۆمەڵێکی تری دژ بە ئیسلام، بوونە هاوپەیمان، لە ساڵی

(١٩٠٩)ز، سوڵتان (عبدالحميد الثانی) له (خلافة)ی ئیسلامیان لادا، ئینجا بەرە بەرە جولەکە هەوڵیان دا بە پاڵپشتی کافرەکانی ئینگلیزو نۆکەرایەتی (مصطفی کمال أتاتورك)-جزاه الله بسيئاته- لە (٣)ی ئازاری (١٩٢٤)ز، بەرامبەر (١٣٢٧)ك، بە یەکجاری (خلافة)ی ئیسلامیان لەناو بردو دەوڵەتی ئیسلامیان تێکدا، بڕوانە (كيف هدمت الخلافة) ل(٤٥) و(١٨٦) و(عداوة الانكليز للاسلام) ل(١٤١).

## ﴿ئامانجی پیلانەکە﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: کاتێك تەماشای پرۆتۆکۆلاتی (حكماء صهيون) دەکەین، باش بۆمان ئاشکرا دەبێ: کە ئامانجی کافرەکان تەنها دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکە نیە لە (فلسطين)، بەڵکو ئامانجیان بێهێزکردنو تێکدانی ڕیزی موسوڵمانانە، ئەوان چاك دەزانن: بەهێزترین پیلان بۆ ئەم ئامانجە گڵاوە: دوورخستنەوەی موسوڵمانانە لە زانایانی ئایینی، بە تایبەتی هەر چوار زانایەکانی سەر مەزهەب، چونکە گومانیان لەوەدا نیە: کە ئەم (عبدالحميدالثانی)یە-کە خاوەنی ئەم هەڵوێستە ئیسلامی یە بوو- لە سەر (فِقه)ی مەزهەبی ئیمامی(حنفی)و (عَقيدة)ی مەزهەبی ئیمامی(الماتريدی) بوو.

کاتێکیش بیر دەکەنەوە، دەبینن: (صلاح الدين الايوبی)- کە پشتی (صليبي)یەکانی شکاندوە- لە سەر (فِقه)ی مەزهەبی(شافعی)و (عَقيدة)ی مەزهەبی ئیمامی(ألأشعري) بووە-ان شاء الله- لە پێناسەی (ألأشعري)دا ڕوونی دەکەینەوە.

کەوابوو: کافرەکان بە پێویستی دەزانن: موسوڵمانان لە بەرهەمی زانایانی ئەم چوار مەزهەبانە بە دوور بخەنەوە، فەرموو تەماشا بکە: بەرپرسێکی (وزارة الخارجية)ی (فرنسا) بەرهەمی زانایانی ئەم چوار مەزهەبانە، بە هۆی یەکگرتنو خۆڕاگری ی موسوڵمان دائەنێو لە ڕاپۆرتێکی دا دەڵێ: (فَهُمْ-أي المسلون- يَمْلِكُونَ تـراثَهُمْ الرُوحي الخاصَ بِهِمْ، وَيَتمَتعُونَ بحَضارَةٍ تأريخيَـة ذاتِ أصَالةٍ.) واتە: موسوڵمانان خاوەنی بەرهەمو میراتێکی ڕوحی ی تایبەت بەخۆیانن، سود لە شارستانیەتێکی مێژوویی ڕەسەن وەردەگرن. بڕوانە پەرتوکی (دَمِّرُوا الإسلام) ل(٣٨).

## ﴿ حارِبِ الإسْلامَ بِالإسْلامِ ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم دروشمەی (حارِبِ الأسْلامَ بِالإسْلام)، واتە: بە ئیسلام جەنگ لەگەڵ ئیسلام بکە. دروشمێکی کافرەکانی ڕۆژئاوایە؟ کاتێك کافرەکان بیریان لێ کردەوەو زانییان: موسوڵمانان خاوەنی میراتو بەرهەمی ڕەسەنی زانایانی ئیسلامن، ئەو میراتەش هەر میراتی پێغەمبەرە ﷺو زانایانی ئاین بە موسڵمانانی ڕادەگەیێنن، هەڵسان پیلانیان دارشت بۆ دوورخستنەوی موسوڵمانان لەم بەرهەمە بە سودە: کە کتێبەکانی هەر چوار مەزهەبەکانن:

یەکەم جار بە ناوی ئەوەی: ئەم کتێبە پەڕ زەردو تۆزاویانە بونەتە هۆی ئەوەی موسوڵمانان لە کاروانی پێشکەوتن دوا بکەون. بەڵام ئەم پیلانە تەنها بە شێوەیەکی کاتی سەرکەوتنێکی کەمی وەدەست هێنا، الحمدلله زوو پوچەڵ بۆوە.

دووەم جار: لە ڕێگەی چەند موسوڵمانێکی بەکرێگیراوی سەر لێشێواو، کە ئەم بەکرێگیراوانە بۆ تەفرەدانی موسوڵمانان دروشمی (اَلْقُرْآن وَالسُنَّة) بەرز دەکەنەوەو لاوەکانمان هەڵدەخەڵەتێننو دەڵێن: (تەنها ئێمە ڕەفتار بە قورئانو حەدیس دەکەینو ئەم چوار مەزهەبانە درۆنەو دژ بە قورئانو حەدیسن). لە کوردستانیشدا بە ئاشکرایی‌و بە بێ پەردە بە ناوی ئیسلام دەرس دەدەنە گەنجەکانمانو دەڵێن: (ئەم زانایانەی ئیسلام بە کتێبە زەردەکان فێرکراونو هیچ لە ئیسلام تێنەگەیشتون).؟ ﴿ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ﴾(آل عمران: ١١٨)، بەڵێ: ڕقو قینەیان-بەرامبەر بە زانایانی ئیسلام- لە گوفتاریان دەرکەوتو ئەوەی لە ناو دڵیاندایە گەلێك لەم ڕقە گەورەترە.

جا باشترین بەڵگەش: بێ ئەدەبی ی (ألبانی) پێشەواکەیانە-کە لە پێناسەی ئیمامی (حنفی)دا باسمان کرد- ئەم بێئەدەبانەش هەر لە (ألبانی) فرچکیان خواردوە، بۆیێ وەها قین لە دڵو بێئەدەبن بەرامبەر زانایانی ئیسلام، لاوەکانیان فریوداوەو لە بەرهەمی ئەم زانا بەڕێزانەیان بێبەش کردونو بە نامیلکۆکەی ڕەنگاوڕەنگی ژەهراوی-کە لە (أمریکا)و (بریطانیا)و (فرنسا)وە دێن- پەروەردەیان دەکەنو ناوی ئیسلامیشی لێدەنێن!.

## ﴿ ڕای نۆکەرانی کوفر بەرامبەر ئەم چوار مەزهەبە﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: لە ڕاپۆرتەکەی (وزارة الخارجیة)ی (فرنسا)دا بۆت ئاشکرا بوو: کافرەکان چەند دژی بەرهەمی ڕەسەنی زانایانی ئەم چوار مەزهەبانەن، کەوابوو: بە سەیری مەزانە: پێشەوایەکی (خوارج)ی سەرلێشێواوی وەکو (الدکتور مروان القیسی) بۆ خزمەتی کوفرو بۆ دڵنیاکردنی (فرنسا)، هێرش بکاتە سەر پێشەوایانی ئەم چوار مەزهەبەو وەکو (قەشەو مالم)ی گاورو جووەکانیان دابنێو شوێنکەوتەی ئەم چوارانەش وەك گاورو جووەکان دابنێ، فەرموو بە چاوی خۆت ببینە: ئەم گومڕابووە، لە لاپەڕە (١٦٢)و (١٦٣)ی کتێبەکەی خۆی دا-(معالم الهدی إلی فهم الاسلام) چاپی سێیەم- دەڵێ:

(اخیراً فإن القول ان المذهبیة اسلم، وانه لابد من الألتزام بآراء مذهب ما، هو قول خطیر یتضمن ما یتضمن من الشرك، فإن الله تعالی لم یتعبد احدا من خلقه بإتباع احد مهما سما قدره فی العلم مادام غیر معصوم، وهنا فلیس من باب التکرار ان اعید ماورد: ﴿ أن عَدِيّ بن حاتم سمع النبيَّﷺ یقرأ هذه الآیة: (اِتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللهِ)،

فقال: إِنَّا لَسْنَا نَعْبُدُهُمْ، قال: أَلَيْسَ يُحَرِّمُونَ مَا أَحَلَّ اللهُ فَتُحَرِّمُونَهُ، وَيُحِلُّونَ مَا حَرَّمَ اللهُ فَتُحِلُّونَهُ؟ فَقُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَتِلْكَ عِبَادَتُهُمْ ﴾ واته: ئەم گوتەیەی ئەڵێ: مەزهەبی باشترەو پابەندبوون بە مەزهەبێکەوە پێویستە، ئەمە گوتەیەکی ترسناکەو لە ناو خۆی دەگرێ: ئەو (شرك)ەی لە ناوی دایە! چونکە خوای گەورە دوای ئەو پەرستنەی لە هیچ کەس نەکردوە: کە شوێن کەسێك بکەوێ، هەرچەند پلەی زانستیشی زۆر بەرز بێ، مادام پارێزراو نەبێ لە گوناه، لێرەدا دووبارە نیە ئەگەر ئەم حەدیسە بێنمەوە: کە (عدی بن حاتم ) گوێ ی لە پێغەمبەرﷺ بوو، ئەم ئایەتەی ڕابردووی دەخوێندەوە، کە خوا دەفەرموێ: (جووەکانو دیانەکان قەشەو مالمی خۆیان کردونەتە خوا جگە لە خوا). جا (عدی) گوتی: خۆ ئێمە نەمانپەرستون. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەگەر حەڵاڵێکی خواتان بۆ حەرام بکەن ئێوەش بە حەرامی نازانن‌و ئەگەر حەرامێکی خواتان بۆ حەڵاڵ بکەن ئێوەش بەحەڵاڵی نازانن؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: ئەمە پەرستنیانە.

بەڵێ ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم دکتۆرە گومڕابووە، موسوڵمانانی هەزارو دووسەد ساڵ بە (مُشْرِك) دائەنێ، چونکە پابەندبوونیان بە یەکێك لە چوار مەزهەبانە پێ باشە، (خوا سزای ئەم گۆتەیەی بداتەوە). ئینجا جەنابی (د.مروان) شەرمیش لە درۆیەکەی خۆی ناکا کە دەڵێ: (خوا داوای ئەو پەرستنەی لە هیچ کەس نەکردوە: کە شوێن کەسێك بکەوێ). زۆر سەیرە: ئەوە ئایەتی ﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ ﴾ (الانبياء:٧)، فەرمانی خوای گەورەیە: کە واجبە پرسیار لە زانایانی ئایین بکەین ئەگەر نەمانزانی!. باشە ئەدی ئەم پرسیارکردنە نابێتە شوێنکەوتنی زانایانی ئایین؟!، جا ئەگەر (د.مروان) ڕاست ئەکاو درۆ ناکا، با حەرامێکی خوا، یان حەڵاڵێکی خوا بڵێ، کە بە (إجماع) حەرام، یان حەڵاڵ بێ‌و ئەم چوار ئیمامانە- لە دژی خوا- حەرام، یان حەڵاڵیان کردبێ، (دەك ڕووی درۆزن ڕەش بێ).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئاشکرایە: ئەم چوار ئیمامانەی (د. مروان) بە (قەشەو مالم)ی داناون، هەر چواریان قوتابی قوتابخانەی پێغەمبەرن‌وﷺ بە (مَنْهَج)ی (السلف الصالح) پەروەردە کراون‌و زنجیرەی زانستیان بە چوار ئەڵقە دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، بەڵام ئاخۆ دکتۆری گومڕابوو، لە کام قوتابخانە دەرچوبێ؟.

هەر لەلاپەڕە (١٨)ی کتێبەکەی ناوبراوی دا، نوسراوە: (شاء الله له أن يرتحل إلى بريطانيا لنيل شهادة الدكتوراه من احدى جامعاتها). بەم ڕستەیە بۆمان ئاشکرا بوو: کە دانەری گومڕابوو، قوتابی قوتابخانەی (دارالكفر)ی (بریطانیا)یەو بە (منهج)ی ئینگلیزی (کافر) پەروەردە کراوەو شەهادەی (دکتۆراه)ی دراوەتێ: بۆ لێدانی ئیسلام‌و تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان. ئینجا منیش دەڵێم: (تا کوفر نۆکەری ئەوهای هەبێ، بۆ چی چەکی کۆکوژ لە دژی موسوڵمانان بەکار بێنێ؟).

هەر (مروان القيسى)ى گومڕابوو، لە پەلاڕە (١٢٨) كتێبەكەى ناوبراوى دا دەڵێ: (حرمت الأمة الافادة من اقوال صحيحة خالف الأئمة الأربعة فيها مجتمعين الحديث الصحيح: كطلاق الثلاث...) ئينجا دەڵێ: (وهذه المسئلة افتى بها إبن تيمية رحمه الله تعالى وكانت السبب فى اتهامه بالكفر والردة...)، واتە: ئەم ئوممەتە بێبەش كراوە لە سود وەرگرتن لە چەند فەرموودەيەكى ڕاست، كە هەر چوار ئيمامەكان بە يەكدەنگى دژايەتى حەديسى ڕاستيان كردوە: وەكو تەڵاقى سێبەسێ، (واتە: هەرچوار مەزهەبەكان بە يەكدەنگى فەرموويانە: تەڵاقى سێبەسێ بە يەك جار دەكەوێ)...ئينجا دەڵێ: لەم مەسەلەدا (إبن تيمية) فتواى داوە، (واتە: دەڵێ: تەڵاقى سێبەسێ بە يەك جار ناكەوێ)، ئەمەش بووە هۆى تۆمەت پێكردنى بە كوفرو وەرگەڕانەوە لە ئايين.

جا ئێمەش دەڵێين: (خوا ڕووى درۆزن ڕەش بكا)؟ چونكە دەيەوێ بە هۆى هەڵەى زانايەك موسوڵمانان توشى زينا بكا!، خۆ مەسەلەى تەڵاقى سێبەسێ-كە دەكەون- بڕيارى ئيمامى(عمرﷺ)ى خەليفەى پێغەمبەرەﷺ، لە كاتى ئەم بڕيارەشدا هەردوو خەليفەكەى ترى پێغەمبەرﷺ-ئيمامى(عثمانﷺ)و ئيمامى(علىﷺ)-و كۆمەڵێكى ترى (صحابة)ى پێغەمبەرﷺ زيندوو بونو ئاگادارى ئەم بڕيارە بونو ڕەخنەيان نەگرت، كەوابوو: ئەم بڕيارە بە (إجماع)=يەكدەنگى ئەم سێ خەليفەيە بوو-رضىالله عنهم- هەر چوار ئيمامەكانى سەر مەزهەبيش شوێن ئەم سێ خەليفەيە كەوتون، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ ﴾ رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، واتە: شوێن سوننەتى منو خەليفەكانى من بكەون.

جگە لەمەش: دەربارەى ئيمامى(عمرﷺ) پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ إنَّ اللهَ جَعَلَ الْحَقَّ عَلى لِسانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، واتە: خواى گەورە ڕاستى ى داناوەتە سەر زوبانو دڵى (عمر). جا ئەى جەنابى ناتێگەيشتووى پێنەگەيشتوو، بەسە بەسە: هيچىتر لاوەكانمان تەفرە مەدەو لە ڕێبازى خەليفەكانى پێغەمبەرﷺ لايانمەدەو ڕاستيەكەى سەر زوبانو دڵى ئيمامى(عمر) مەشارەوەو مەيشێوێنە، كەس ئەوە باوەڕ ناكا: كە تەنها ئەتۆ بە حەديس ڕەفتار بكەىو ئەم سێ خەليفەو ئەم چوار ئيمامەش بە پێچەوانەى حەديس ڕەفتاريان كردبێو لە ڕێبازى پێغەمبەرﷺ لاياندابێ.

دووبارە: ئەوەش هەر درۆيە، كە دەڵێ: (إبن تيمية) بە هۆى مەسئەلەى تەڵاقى سێبەسێ تۆمەتى كوفرى پێ كرا. بەڵكو ڕاستيەكەى ئەمەيە: (إبن تيمية) زماندرێژى ى كردە سەر هەردوو خەليفەى پێغەمبەرﷺ: ئيمامى(عمرﷺ)و ئيمامى (علىﷺ)و گوتى: (عمر) زۆر بە هەڵەدا چووەو (على)ش سێسەد جار هەڵەى كردوە.

ئینجا لەم سنورەش نەوەستاو لە کۆتایی وتارەکەی هەینی دا گوتی: (إن الله يتنزل من السماء كتنزولي هكذا) خوای گەورە لە ئاسمان دێتە خوارەوە، وەکو هاتنە خوارەوەی من.
ئیتر بە هۆی ئەم گۆتە ناشیرنانەو بە هۆی چەند (فتوا)یەکی هەڵە–کە بوونە هۆی ئاژاوە لە نێوان موسوڵمانانندا– زانایانی هەر چوار مەزهەب لە دژی هەڵسانو لیژنەیەکی (فتوا)یان پێك هێناو بڕیاریاندا: بەند بکرێ، هەر لە بەندیخانەشدا مرد، بڕوانە (روضة المحتاجين) ل(٣٨٣و ٣٩١) چاپی(٢)و (المعلومات النافعة) ل(٢٦٨كو ٢٦٩و ٢٧٣).
ئەی لاوی موسوڵمان: هەر واجبە: ڕێزی زانستی (إبن تيمية) لە ناو دڵماندا هەبێ، چونکە زانایەکی (مجاهد) بووە، بەڵام ناگاتە پلەی ئیمامی (عمرﷺ)و ئەو مافەی نیە ڕەخنە لە ئیمامی (عمرﷺ) بگرێ، چونکە ئیمامی(عمر) قوتابیو پەروەردەکراوی بەردەستی پێغەمبەرەﷺ، هەروەها نابێ ئەو زانستەش بشارینەوە: کە (إبن تيمية) لە نێوان ساڵی (٦٦١و٧٢٨)ی کۆچی دا ژیاوە، واتە: لە چینی زانایانی (خَلَف) دەژمێردرێ.
جا بە داخەوە: لە حەڤدە مەسەلەدا بە پێچەوانەی (إجماع)ی (أهل السنة والجماعة) فتوای داوە–کە مەسەلەی تەڵاقی سێبەسێ یەکێکە لەم حەڤدە مەسئەلانە– ئاشکرایە: هەر (فتوا)یەکی(خَلَف) بە پێچەوانەی (إجماع)ی (سَلَف)ی(أهل السنة) بێ، ڕەفتاری پێناکرێو وەرناگیرێ–هەروەك لە باسی(إجماع)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى– ئینجا بۆ زانینی ئەم حەڤدە مەسەلەیە بڕوانە (الفتاوى الحديثية لابن حجر الهيتمي) ل(١١٦).

## ﴿( إجْمَاع )=یەکدەنگی زانایانی ئیسلام ﴾

(إجْماع) واتە: یەکدەنگی چینێکی زانایانیئاییِنی: لە سەر بڕیارێکی شەریعەتی ئیسلام، کە لە قورئانو حەدیس وەریانگرتوە.
لە (عَقِيدَة)ی (أهل السنة)دا واجبە: گوێڕایەڵی (إجْمَاع)ی زانایانی ئیسلام بین، هەر (فتوا)یەکیش دژ بە (اجماع) بێ، ڕەفتاری پێ ناکرێو ڕەد دەکرێتەوە، هەروەك ئیمامی (الطحاوي) دەفەرموێ: (ولا نُصَدِّقُ كاهناً وَلا عَرَّافاً وَلا مَنْ يَدَّعِي شَيْئاً يُخالِفُ الْكِتَابَ وَالسُنَّة وَإِجْمَاعِ الأُمَّة، وَنَرَى الْجَماعَةَ حَقّاً وَصَوَاباً وَالْفُرْقَةَ زَيْغاً وَعَذاباً) واتە: ئێمەی (أهل السنة) باوەڕ بە فاڵچیو پەنهانخوێنەکان ناکەین، هەروەها باوەڕیش بەو کەسە ناکەین کە داوایەك بکا: داوایەکەی بە پێچەوانەی قورئانو حەدیسو (إجماع)=یەکدەنگی زانایانی ئوممەتی ئیسلام بێ، باوەڕمان وایە: یەککۆمەڵی موسوڵمانان ڕاستەو واجبە، پەرتەوازەو تاکڕەوی لادانە لە ڕاستیو هۆی سزای قیامەتە. بڕوانە (العقيدة الطحاوية).
بەڵگەی (أهل السنة) کە دەڵێن: واجبە ڕەفتار بە (إجماع) بکرێ، ئەم ئایەتەیە: ﴿ وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَاتَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَاتَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ

وَسَاءَتْ مَصِيراً﴾ (النساء:١١٥)، واتـه: هـەر کەسێك دژ بـەرێبازی پێغەمبـەرﷺ بـێ، پـاش ئەوەی ڕێگەی ڕاستی بۆ ڕوون بۆوە، جگە لە ڕێگەی موسوڵمانان شوێن ڕێبازێکی تر بکـەوێ، دەیدەینە دەست ڕێبازەکەی خۆیو دەیبەینە دۆزەخ کە خراپترین شوێنە. ئیمـامی(الـشافعی) بەم ئایەتە بەڵگەی هێناوەتەوە: لە سەر (إجماع)، بڕوانە (تفسیر روح المعانی) ل(١٤٦)ب(٥).

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿ عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الإِثْنَيْنِ أَبْعَدُ، مَنْ أَرَادَ بَحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمِ الْجَمَاعَةَ ﴾ رواه الترمـذي بسند صحيح، واته: واجبە ئێوە لەگەڵ کۆمەڵدا بنو پەرتەوازەو تاکڕەوی نەکەن، چونکە شەیتان لەگەڵ یەك کەسدایەو لە دوو کەسان دوورتـرە، هـەر کـەس ناوەنـدی بەهەشـتی ئەوێ، با هەر لەگەڵ کۆمەڵدابێ.

مەبەست ئەوەیە: شەیتان بە ئاسانی مرۆڤی تاکڕەو بە هەڵەدا دەبا، بەڵام کە بونـە دوو، یان زیاتر، لە هەڵـە دوور دەکەونـەوە، چـونکە شـەیتان بـە ئاسـانی بەروەسـتیان ناکـا، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿...فَعَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ، فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الْغَــنَمِ الْقَاصِيَةَ ﴾ رواه النسائی بسند حسن، ئێوە هەر لەگەڵ کۆمەڵدا بن، چونکە گورگ مەڕی دوور لە مێگەل دەخوا.

کەواتە: خاوەنی (فتـوا)ی تـاکڕەو، وەکـو مـەڕی دوور لـە شـوانو مێگەلـەو بـە ئاسـانی شەیتان دەیگاتێو توشی هەڵەی دەکا، کەوابوو: واجبـە ڕەفتـار بـە یەکدەنگی کۆمەڵـە گەورەکـەی (أهـل الـسنة) بکـرێ، ئینجـا بزانـە: (شـیعة)و چـینێکی (خـوارج) باوەڕیـان بە (إجماع)ی (أهل السنة) نیە، بڕوانە (حاشیة البهشتی) ل(١٠٤).

## ﴿( إجْمَاع )و حەدیسی پێغەمبەرﷺ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان : ئـەم زانسـتەی ئیسلام لـە (قُرآن) و (حـدیث)ی (صـحیح)، یـان (حَسَن) وەردەگیرێ، بەڵام (حدیث)ی (ضَعیف)=بێهێز، بەم شێوەیە:

ئیمـامی(الـشافعی) دەفـەرموێ: ئەگـەر خـەڵك–واتـە: زانایـانی ئـایین بـە تێکڕایـی– بە حەدیسێکی (ضعیف) ڕازی بونو قوبوڵیان کرد، ئەوە دەبێتە بەڵگەو بـۆ بڕیارەکـانی شەریعەتو شتی تر بەکار دێ. واتە: چونکە دەبێتە (اجماع).

ئیمامی(أحمد) دەفەرموێ: بەو مەرجە حەدیسی(ضعیف) بەکار دێ: ئەگەر حەدیسێکی تر نەبێو دژایەتیشی نەبێ، واتـە: لەگـەڵ (قـرآن)و حەدیـسێکی تـری (صـحیح). بڕوانـە (حاشیة المدابغی) ل(٣٢).

ئیمام(النواوی) دەفەرموێ: زانایـنی حـەدیسو شـەرع دەفـەرموون: دروسـتەو سـوننەتە: حەدیسی (ضعیف) بەکار بێ: بۆ کاروباری چاکەو ترساندنو هاندانی خەڵك، بەو مەرجەی (مَوْضُوع) نەبێ. بڕوانە (الاذکار) ل(٥).

ئیمام (إبن حجر الهیتمي) دەفەرموێ: ئەگەر مرۆڤ نەیئەزانی حەدیس لێك جیا بكاتەوەو دیتی ئیمامێك حەدیسێكی بە (صحیح)، یان بە (حسن) داناوە، ئەبێ شوێنی بكەوێ، واتە: بۆی هەیە بە مەزهەبی ئەم ئیمامە ڕازی بێ. بڕوانە (فتح المبین شرح الأربعین) ل(١٩٤) و(تحفة المحتاج) ل(١٠٨) ب(١٠).

كەواتە: ئەگەر ئیمامێكی پێشووی وەكو (الترمذي)و (البیهقی) و(المنذري)و (الهیثمي) حەدیسێكیان بە (صحیح)، یان بە (حسن)، یان بە (ضعیف) دانابو، ئەوە بەسە، زیاتر لێكۆڵینەوەی ناوێ، بڕوانە (مفاهیم یجب أن تصحح) ل(٧) چاپی(٣).

ئەی لاوی موسوڵمان: لەم باسەدا بۆت ئاشكرا بوو: كە (البانی) خیانەتێكی چەند گەورەی لە حەدیسی پێغەمبەرﷺ كردەوە، لە كتێبی (سلسلة الاحادیث الضعیفة والموضوعة)دا چەند حەدیسی(ضعیف)—كە بەكار دێن—دایبەزاندونەتە ڕیزی حەدیسی (موضوع)، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر تێنەگەیشتنی (البانی) لە (علوم الحدیث)، هەروەك (مُحَدِّث)ی هیندی (حبیب الرحمن الأعظمي) دەفەرموێ: (ألبانی) لە دەمی زانایان زانستی وەرنەگرتوەو لەبەر دەستی زانایان دانەنیشتوە بۆ زانستی بەسود-زانستیش تەنها بە خوێندن دەست دەكەوێ- كەوابوو: (البانی) چیەتی خۆی تێكەڵی زانست دەكاو نەشی خوێندوە؟ وام پێگەیشتوە: كە كۆتای پلەی زانستی (ألبانی) كتێبە كورتەكەی (القدوری)یەو لێزانیە گەورەكەشی (سەعاتسازی)یە، بە خۆیشی دانی پێدائەهێنێو شانازیشی ی پێوە دەكا. بڕوانە (الألباني: شذوذه وأخطاؤه) ل(٩) ب(١) (الطبعة الأولى، مكتبة العروبة— الكویت).

ئەی لاوی موسوڵمان: خوا ڕەحم بەو كەسە بكا كە فەرموویەتی:

(مَنْ اَخَذَ الْعِلْمَ مِنْ غَیْرِ شَیْخٍ، یَضِلُّ عَنِ الصِّراطِ الْمُسْتَقِیم
وَكَمْ مِنْ عَائِبٍ قَوْلاً صَحِیحاً، وَآفَتُهُ مِنَ الْفَهْمِ السَّقِیم)

واتە: هەر كەسێك بە بێمامۆستا زانست وەربگرێ، گومڕا ئەبێو لە ڕێگەی ڕاست لائەدا، چەند كەسانێك ڕەخنە لە فەرموودەیەكی ڕاست دەگرن، بەڵام ناتەواوی لە تێگەیشتنە نەخۆشەكەی ئەوانە. بڕوانە (نظرة ربانیة في المسائل الفقهیة) ل(٣٤).

**(ئاگاداری)**: ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: هەر كاتێك حەدیسێكی (آحاد) دژایەتی لەگەڵ قورئان، یان لەگەڵ (إجماع)دا هەبوو، واجبە: واز لە واتەی ئاشكرای حەدیسەكە بهێندرێ. واتە: واجبە واتەیەكی وای لێ بدرێتەوە: لەگەڵ قورئانو (إجماع) ڕێك بكەوێ. بڕوانە (المجموع شرح المهذب) ل(٣٤٢) ب(٤).

إن شاء الله لە باسی دایكو باوكی پێغەمبەرداﷺ ڕوونی دەكەینەوە.

## ﴿ جیاوازیی مەزهەب لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبوە ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: دەزانم (خوارج) پێت دەڵێن: (ئەم چوار مەزهەبانە (بدعة)نەو ڕاست نین، ئەگەر ڕاست بن ئەم جیاوازییە بۆ چییە)؟.

لە وەڵامی دا بڵێ: کاکەی سەر لێشواو، چونکە جەنابت (بدعة)کارە، بۆیێ (بدعة)ت لێ بووەتە (سنة)، (سنة)ت لێبووەتە (بدعة). خۆ ئەوەمان باس کرد: کە ئەم چوار مەزهەبانە، بە (إجماع)ی (السلف الصالح) دامەزراون، (اجماع)ی (سلف)ش نابێتە (بدعة)، چونکە حەدیسی ﴿خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِـي...﴾ شاهیدیانە، واتە: بە هیچ جۆرێك ناگونجێ: پێغەمبەر ﷺ شاهیدی بۆکۆمەڵێکی (بدعة)کار بدا.

جگە لەمەش: بە ئاشکرایی جیاوازی (مەزهەب) لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبو، بەڵگە:

﴿ عن ابن عمر رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قال يَوْم الأَحزاب: لا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فـي بَنِيقُرَيْظَةَ، فَأَدْرَكَ بَعْضُهُمُ الْعَصْرَ في الطَّرِيقِ، فَقالَ بَعْضُهُمْ: لا نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهـا، وَقـال بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصلِّي لَمْ يُرِدْ مِنَّا ذلِك، فذُكِرَ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يُعَنِّفْ واحِـداً مِـنْهُمْ ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: پێغەمبەر ﷺ -لە ڕۆژی جەنگی(أحْزاب)دا- فەرمووی: نابێ هیچ کەسێك نوێژی(عەسر) بکا، تا لە ناو هۆزی (بَنِي قُرَيْظَة)دا دەیکا، ئینجا لە ڕێگادا کاتی نوێژی(عەسر) هات، کۆمەڵ (صحابة)یەك فەرموویان: ئێمە نوێژەکە دوا دەخەین و نایکەین تا دەگەینە (بَنِي قُرَيْظَة)، کۆمەڵێکی تر فەرموویان: ئێمە ئێستا نوێژەکە دەکەین چونکە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ نەکردن نیە، بەڵکو مەبەستی پەلە کردنە بۆ گەیشتنەجێ، ئینجا ئەم جیاوازییە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرا، ئەویش ڕەخنەی لە هیچ کۆمەڵێك لەم دوو کۆمەڵە نەگرت.

ئەی لاوی موسوڵمان باش بیر بکەوە: پێغەمبەر ﷺ هەر لە ژیاندا بوو، (حدیث) هەر یەك (حدیث)بوو، ئەدی لە بەرچی هەر لە یەك نوێژدا دوو (مەزهەب)ی جیاواز دروست بون: مەزهەبی(نوێژکەرەکان)و مەزهەبی(دواخەرەکان)؟ جا لە بەر ئەوەی ئەم جیاوازییە، بە هۆی جیاوازی تێگەیشتن لە مەبەستی حەدیسەکە ڕوویدا، پێغەمبەر ﷺ بەم جیاوازی یە ڕازی بوو، چونکە هەردوو کۆمەڵ (مُجْتَهِد) بوون: کۆمەڵێك بە دەقی حەدیسەکە ڕەفتاری کردو ڕستەی (لايُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ في بَنِيقُرَيْظَةَ)ی لە واتەی ئاشکرای خۆیدا بە کاری هێنا، کۆمەڵەکەیتریش بە (تأویل)ی حەدیسەکە ڕەفتاری کردو هەمان ڕستەی لە واتەی ئاشکرای خۆی لای داو لە مەبەستی پەلە کردن بەکاری هێنا.

ئەی لاوی موسوڵمان-بۆ نمونە- پێت دەڵێم: مەزهەبی(حنفی) دەفەرموێ: دەستنوێژ لە ئافرەت ناشکێ. مەهەزبی(شافعی)ش دەفەرموێ: دەستنوێژ لە ئافرەت دەشکێ. هەردووکیان بەڵگە بە ئایەتی ﴿ أَوْ لامَسْتُمُ النِّساءَ ﴾ دەهێننەوە، (حنفی) دەفەرموێ:

مەبست (جِمَاع)کردنە، نەك دەست لێدان. (شافعي) دەفەرموێ: مەبەست دەست لێدانە، نەك (جماع)کردن.

جا ئەی لاوی موسوڵمان: دەبینین: ئایەت هەر یەك ئایەتە، هەروەك حەدیسەکەی ڕابردووش هەر یەك حەدیس بوو، بەڵام جیاوازی ئەم دوو ئیمامە-وەکو دوو کۆمەڵەکەی صحابة- بە هۆی جیاوازی تێگەیشتن لە واتەی ئایەتەکەدا ڕووی داوە، چونکە زمانی (عَرَبِي) گەلێك دەوڵەمەندە، زۆر واتە لە ناو خۆیدا کۆ دەکاتەوە، جا نمونەی ئەم بابەتە زۆرە، بەڵام ئەو کەسەی کەسە، ئەوەندەی بەسە.

﴿ اَللاَّمَذْهَبِيَّة قَنْطَرَةُاللاَّدِينِيَّة: بێمەزهەبی پردی بێدینی یە ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم سەردێڕە، سەر دێڕێکی لاپەڕە (١٢٩)ی (مقالات الكوثري) بوو، چاك بیری لێ بکەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمان دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ يَأْتُونَكُمْ مِنَ الأَحَادِيث بما لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلا آبَــاؤُكُمْ، فَإِيَّــاكُمْ وَإِيَّــاهُمْ لا يُضِلُّونَكُمْ ولا يَفْتِنُونَكُمْ ﴾ رواه مسلم في مقدمة صحيحه، واتە: لە کۆتایی زەماندا چەند فێڵبازێکی درۆزن پەیدا ئەبن، حەدیسی وەهاتان بۆ دێنن: کە نە ئێوەو نە باوك و باپیرانتان نەتانبیستون، ئاگاداری خۆتان بن و خۆتان لەوان بپارێزن، نەوەکو گومڕاتان بکەن و لە ئاین لاتان بدەن.

ئەی لاوی موسوڵمان: وا بە چاوی خۆت دەبینی: ئەمڕۆ مەبەستی ڕاستی ئەم فەرمودە شیرنەی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا بووەو (لامذهبي) بێمەزهەبەکان دەڵێن: (زانایانی ڕابردوو ئەم حەدیسانەیان نەدیتون). یان دەڵێن: (زانایانی ڕابردوو نەیانزانیوە ئەم حەدیسە بێهێزە، وا ئێستا زانست بەرەو پێش دەڕواو زانایانی ئێستا شارەزاترن لە ڕابردووەکان). بەم فێڵ و درۆیانە گەنجەکان گومڕا دەکەن و دەیانکەنە (بێ مەزهەب)=(لا مذهبي).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوە درۆیە باوەڕ مەکە، چونکە زانستی ئاین بەرەو پێش ناڕوا، بەڵکو زانستی ئاین کەم دەبێتەوە، کەمبوونەوەشی یەکێکە لە نیشانەکانی دونیا وێرانبوون، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْـمُ وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ ﴾رواه الترمذي بسند صحيح، هەندێك لە نیشانەکانی دونیا وێرانبوون ئەوەیە: زانستی ئاین نەمێنێ و نەزانی ئاشکرا ببێ.

کەوابوو : پێویستە -بۆ خۆ پاراستن لەو فێڵباز و درۆزنانە-زنجیرەی زانستی ئەو زانایانە بزانین کە ئایینی ئیسلامیان لێ فێر دەبین، چونکە ئیمام (إبن سيرين) دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَذَا الْعِلْمَ دِينٌ، فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ ﴾رواه مسلم، ئەم زانستە ئایینە، کەوابوو: بڕوانن ئایینتان لە کێ وەردەگرن.

ئەی لاوی موسوڵمان: بە کاکی (لامذهبي) بێمەزهەب بڵێ: کاکە گیان چۆن ئێمە ئایین لە ئێوە وەربگرین، خۆ ئێوە زنجیرەی زانستتان بچڕاوە، چونکە لە ڕێگەی زانایانی ڕابردووەوە وەری ناگرن، ئەوەشتان پێ باوەڕ ناکەین: ئەگەر بڵێن: ئەم ئایینەمان لە ئاسمان بۆ هاتۆتە خوارەوە، چونکە ئەمە تایبەت بە پێغەمبەرەﷺ، ئینجا پێویستە زانستی ئایین لە پێغەمبەرەوەﷺ بە ڕێگەی زانایانی (سلف)دا، ئینجا بە ڕێگە زانایانی (خلف)دا بگاتە ئێمە.

کەوابوو: وەرە–بۆ خاتری خوا– وەرە بیر لەم حەدیسانە بکەوەو بیر لەو چەند لاپەڕەی ڕابردووش بکەوە: جیاوازی (مەزهەب) لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبو، لە سەردەمی (السلف الصالح)دا ئەم چوار مەزهەبانە تۆمار کراوانو متمانەیان پێ کراوە، زنجیرەی زانستی هەر چوار مەزهەبەکان بە سێ، یان بە چوار ئەڵقە دەگاتەوە پێغەمبەروﷺ بە وشەی (خَيْرُ أُمَّتِي) پێغەمبەرﷺ شاهیدی بۆ داون، لە سەدەی سێیەمەوە تا ئێستا چەندەها (ملیۆن) موسوڵمان بەگوێرەی تێگەیشتنی زانایانی ئەم چوار مەزهەبانە ڕەفتاریان بە قورئانو حەدیس کردوە.

ئینجا تازە بە تازە: کاکی (خوارج)ی بێمەزهەبی دۆلار خۆر، دەیەوێ: ئەم چوار مەزهەبانە لە ناو بباو حەفتاو دوو مەزهەبی پوچەڵیان لە جێ دابنێ، تازە بە تازە کاکەی (بێ مەزهەب) –بۆ خزمەتی(کُفر)– پێمان دەڵێ: (واز لە (فتح الباری)و (شرح مسلم) بێنن، واز لەم کتێبە پەڕ زەردو تۆزاویانە بێنن، ها ها: ئەمناملیکە ڕەنگاو ڕەنگو پوختانە بخوێنەوە)!.

تازە بە تازە: کاکی (خوارج) پێم دەڵێ: (واز لە (مُوَطَّأ)ی ئیمام (مالك)و (مُسْنَد)ی ئیمام (احمد)و (صحیح البخاری)و (مسلم)و (أبی داود)و (الترمذي)و (نسائي)و...هتد بێنە؟ چونکە حەدیسی (ضعیف)ی تێدایە، وەرە شوێن (شیخنا الفاضل العالم الکامل المُحَدِّث المُجَدِّد: ناصر الألباني) بکەوە، دینی بە ڕاستی هەر (البانی) ڕوونی کردۆتەوە!.

(مەگەر بێ ئەدبیو ڕیز تێکدانی لێ فێر ببین).

کاکی (خوارج) پێم دەڵێ: ئەم چوار مەزهەبانە جولەکە دایانناوە، بەڵام (الدکتور...)و (الدکتور...)و (الدکتور...) شەهادەی دکتۆرایان لە (أمریکا)و (بریطانیا)و (فرنسا) هێناوەتەوە–(شهادة التخصص فى العلوم الإسلامیة)– وەرە وەرە لەم دکتۆرانە فێرە ئیسلام ببە، واز لە (الغزالی)و (فخرالدین الرازی)و (ابن حجر) بێنە؟ چونکە ئەوانە بیرو ڕای جولەکەیان تێکەڵ عەقیدەی ئیسلامو شەریعەتی ئیسلام کردوە!!!.

ئەی لاوی موسوڵمان: وەر بۆ خاتری خوا با بە یەکەوە بەم (خوارج)و بێمەزهەبانە بڵێین: (وەرن ئێوەو گشت (أمریکی)و (بریطاني)و (فرنسی) خۆتان کۆ بکەنەوەو

کتێبێکمان بۆ دابنێن: وەك (فتح الباری شرح البخاری)، یان (شرح مسلم)، یان (مغنی إبن قدامة)، یان (تحفة)ی (إن حجر الهیتمی) یان...، یان...

ئەی لاوی موسوڵمان: هەرچەند (خوارج)ی ئێستا پێت دەڵێن: واز لەم چوار مەزهەبانە بێنەو شوێن قورئانو حەدیس بکەوە، بەڵام درۆ دەکەن، چونکە مەبەستیان بە قورئان: تێگەیشتنە پوچەڵەکەی خۆیانە لە قورئان، کە بە هەواو هەوەستی خۆیان راڤەی قورئان دەکەن، هەروەها مەبەستیشیان بە حەدیس ئەو حەدیسانەیە: کە بەگوێرەی بۆچونی خۆیان واتەی دەڵێنو لەگەڵ هەواو هەوەسی خۆیان دەیگونجێنن، چونکە ئەگەر حەدیسێك لەگەڵ هەواو هەوەسی ئەوان نەگونجێ -هەرچەند (صحیح)ش بێ- هەر وەری ناگرنو گوتەی سەرانی خۆیان لە فەرموودەی گشت ئیمامێك بە راستتر دەزانن، چونکە لەگەڵ هەوەسی ئەوان دەگونجێ.

ئیتر بەسیەتی هەی شەمشەمەکوێرەکانی (خوارج)، هیچی تر بە تاریکی بێمەزهەبی لاوەکانمان گومرا مەکەن، بەسە: هیچی تر سیاسەتی (فَرِّقْ تَسُدْ): پەرت بکەو زاڵ ببە، بۆ بەرژوەندی کوفر جێبەجێ مەکەن.

جا ئەگەر هەر واز ناهێنن، وەرن یەکەم جار ئەم بێمەزهەبیەی خۆتان بە سەر خۆتاندا بسەپێننو دووبارە دایکتان لە باوکتان مارە بکەنەوە؟ چونکە کاتی خۆی بەگوێرەی یەکێك لەم چوار مەزهەبانە مارە کراوەو، ئێوەش هەر لەم مارەبڕینەدا لە دایك بون!!! دایكو باوکی خوا لێخۆشبووتان بە مەزهەبی (شافعی) شوراونو کفن کراونو نوێژی (جنازة)یان لە سەر کراوە، دەك هاوار بەماڵتان شۆفلێشتان دەست ناکەوێ گۆڕستانەکانی کوردستانی پێ وێران بکەن؟ چونکە گشتی لە سەر مەزهەبی (شافعی) مردون.

## ﴿ بەڵگەی شوێنکەوتنی ئەم چوار مەزهەبانە ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان بە چاوی خۆت دەبینی: ئەم دونیایە زانای ئایینی تێدایە، ئاسنگری تێدایە، دارتاشی تێدایە، پزیشکی تێدایە...هتد، خۆ ئەوەش دەزانی: نا گونجێ مرۆڤ هەموو شتێك بە تەواوی بزانێ، بەڵام دەگونجێ: لە هەر شتێك شتێك بزانێ.

ئاشکراشە ئەمەش ڕەوا نیە: مرۆڤ بۆ دەرمانکردنی چاو ئێشان بڕواتە لای دارتاش، بەڵکو ئەوەش ڕەوا نیە بڕواتە لای پزیشکی ددان، کەوابوو: هەر (مرۆڤێكو کاری خۆی)، (نان بۆ نانەوا، گۆشت لە بۆ قەساب).

جا بزانە: ئەم یاسایەی ڕابردووش، خوای گەورە داینا وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ ﴾ (التوبة: ١٢٢)، واتە: نابێ موسوڵمانان بە گشتی ڕاپەڕن بۆ (غەزا)کردن، دەبوا

له هەر هۆزێكی موسوڵمانان كۆمەڵێك بۆ خوێندن ڕاپەڕن تا لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن، تاكو ئەو موسوڵمانانە فێرە دینی خوا بكەن: كاتێ لە (غەزا) دەگەڕێنەوە.
ئەی لاوی موسڵمان خۆ چاك دەزانی: (جهاد) لوتكەی هەرە بەرزی ئیسلامە، لەگەڵ ئەوەشدا، خوا قەدەغەی كردوە: بە گشتی بڕۆین بۆ (غەزا)و فەرمانی داوە: كۆمەڵێكمان بخوێنن تاكو لە (شەرع) شارەزا ببن‌و شەرعی ئیسلام بۆ موسوڵمانان ڕوون بكەینەوە.
بۆ دڵنیایی بڕوانە (تفسير القرطبي) ل(٢٩٣) ب(٨).
ئەی لاوی موسڵمان، هەروەك ناگونجێ هەموو خەڵك ببێتە پزیشك‌و ئاسنگرو...هتد، ناشگونجێ: هەموو خەڵك ببێتە زانایەكی وەها كە لە قورئان‌و حەدیس تێبگا، كەوابوو: دەبێ پزیشك بۆ دەرگەو پەنجەرە بڕواتە لای ئاسنگر، ئاسنگریش بۆ چارەی نەخۆشی بڕواتە لای پزیشك، ئەوانەو خەڵكی تریش بۆ پرسیاری ئایینی بڕۆنە لای زانایانی ئایین، چونكە ئەوان ئەو كۆمەڵەن: كە بە فەرمانی ئەم ئایەتە ڕاپەڕیون بۆ تێگەیشتن لە (شەریعەتی ئیسلام).
جا ئەوەش بزانە: لە سەردەمی (صحابة)وە تا ئێستا، موسوڵمانان پرسیاریان لە زانایانی ئایین كردوەو ئەوانیش وەڵامیان داونەوەو بەگوێرەی وەڵامی ئەوان ڕەفتاریان كردوە، بەم ڕەفتاركردنە دەگوترێ: (تَقلید)، واتە: شوێنكەوتن.
كەوابوو: لە سەر بڕیاری كۆمەڵە گەورەكەی زانایانی (شەرع)و (حدیث)– ئەگەر مرۆڤ توانای (إجتهاد)ی نەبو– واجبە: (تَقلید)ی یەكێك لەو چوار ئیمامانە بكا: لە بڕیارەكانی شەریعەتی ئیسلام، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ (الانبياء:٧) پرسیار لە زانایانی ئایین بكەن ئەگەر نانزانن. بڕوانە (تحفة المريد) ل(٨٢) و(اللامذهبية أخطر بدعة تهدد الشريعة الاسلامية) ل(٧١).
هەروەها ئیمام (ابن الصلاح) گێڕاویەتیەوە: كە (إجماع) لە سەر ئەوە دامەزراوە: دروست نیە–جگە لە مەزهەبی ئەم چوار ئیمامانە– (تَقلید)ی مەزهەبی كەسێكی تر بكا، هەرچەند بۆ كرداری خۆیشی بێ، كەوابوو: بۆ دادكردن‌و (فتوا)دان هەر دروست نیە، چونكە متمانە ناكرێ: بە گەیاندنەوەی مەزهەبەكانی تر بە خاوەنەكەیان بە (سَنَد)ێكی وەها: ڕێگەی گۆڕاندن بگرێ. بڕوانە (بغية المسترشدين) ل(٨).

## ﴿ واتەی (تَقلید)﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: تاكو دڵنیا ببی لەوەی كە (تَقلید) لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ (صحابة)دا هەبوە، فەرموو: با بچینە خزمەت ئەم حەدیسە: ﴿ عن ابن عباس رضي الله عنهما: لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّﷺ مُعاذاً نَحْوَ الْيَمَنِ قَالَ لَهُ: إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكتاب، فَلْيَكُنْ

أَوَّلَ ما تَدْعُوهُمْ إلى أَنْ يُوَحِّدُوااللهَ، فَإذا عَرَفُوا ذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَواتٍ...﴾الحديث رواه البخاري، واتـه: لـەو کاتـەی پێغەمبـەرﷺ حـەزرەتی (معاذ)ی ناردە لای (یمن)، پێی فەرموو: تۆ دەچیە لای گەلێکی خاوەن (کتاب)، دەبـی یەکەم جار بۆ یەکخواناسین بانگەوازییان بکەی، ئینجا کە خوایان بە تـاك ناسـی، پێیـان رابگەێنە: کە خوا پێنج نوێژی لە سەر واجب کردون...هتد.

شوێنی بەڵگەمان لەم حەدیسەدا، ووشـەی (فَأَخْبِرْهُمْ) پێیـان ڕابگەینـە، چـونکە واجبـی زانای ئایینی-وەکو ئەم (صحابة)یە- ڕاگەیانـدنی بڕیـاری خـواو پێغەمبـەرەﷺ، چـونکە واتەی (فتوا)ش هەر ئەم واتەیە، کەوابوو: هەر وەکو خەڵکی (يَمَنْ) شوێن ئەم (صـحابة) بەڕێزە کەوتن-لەگەڵ ئەوەشدا دەیانتوانی بێنە (مدینة) بە خۆیان ئایین لە پێغەمبـەرﷺ فێر بن- ئەوهاش واجبە موسوڵمانان شوێن پێشەوای ئایینی (مجتهد) بکـەون، چـونکە زانایانی ئایین میراتگری پێغەمبەرانن صلى الله عليهم اجمعين.

## ﴿ (تَقْلِید) لە سەردەمی (صحابة)و (التابعين) ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: هـەر بـە بەڵگـەی ئـەم دوو ئایـەتو حەدیـسەی ڕابـردوو، لـە دوای پێغەمبەرﷺ (فتوادەر) لە چینی (صحابة)و (التابعين)و (تابع التابعين)ئەم بەڕێزانە بوون:

١- لە (مدینة)ی پـیرۆزدا: ئیمـامی(عمـر)و ئیمـامی(علـی)و (عبـدالله بـن عمـر)و (زیـد بـن ثابت)رضي الله عنهم، ئینجا قوتابیەکانی ئەوان: وەکو (سعید بن المسیب)و (عـروة بـن الـزبیر)، ئینجا قوتابیەکانی ئەوان: وکو (الزهری)و (یحیـی بـن سـعید)، ئینجـا قوتـابی ی ئـەوان: وەکو ئیمام (مالك)ی سەرمەزهەب.

٢-لە (مکة)ی پیرۆزدا: حەزرەتی (عبدالله بن عباس) رضي الله عنهما، ئینجا قوتابیەکانی ئـەوی: وەکو (عکرمة)و (مجاهد)، ئینجا قوتابیەکانی ئەوان: وەکو (سفیان)و (مـسلم بـن خالـد)، ئینجا قوتابی ی ئەوان: وەکو ئیمامی(الشافعی)ی سەر مەزهەب.

ئینجا بزانە: زنجیرەی ئمام (أحمد)ی سەر مەزهەبیش ئەم زنجیرەیـە)، چـونکە ئـەویش قوتابی ی ئیمامی(الشافعی) بوو.

٣-لـە (کوفـة)دا: حـەزرەتی (عبـدالله بـن مـسعود)ﷺ، ئینجـا قوتابیـەکانی ئـەوی: وەك (علقمة)و قازی (شریح)، ئینجا قوتابیەکانی ئەوان: وەکو (إبراهیم النخعی) ئینجا قوتـابی ئـەوی: وەك (حمـاد)ی مامۆسـتای ئیمـام (أبيحنیفـة)ی سـەر مەزهـەبی(حنفـی). بڕوانە (تأریخ التشریع الاسلامی) ل(٣٠٢)و (٣٠٣).

ئـەی لاویموسـوڵمان: پـێش دامەزرانـدنی هـەر چـوار مەزهـەبی (أهـل الـسنة)، موسـوڵمانان (تقلید)ی یەکێك لەم زانایانەی ڕابردوویان دەکرد، ئینجا کە دەوڵەتی ئیـسلام بـەرفراوان بـوو، خەڵکی فێڵبازیش زۆربوو، زانایانی (سلف) بڕیاری متمانەو باوەڕیـان بـۆ ئـەم چـوار ئیمامـەی

سەر مەزهەب دا، بەم بریارە بەرەڵلاییو پەرتەوازە کەم بۆوە، هەر مەزهەبەش ڕێزی لە مەزهەبەکەی تر دەنا، ئینجا هەر پارچەیەکی دەوڵەتی ئیسلام-بە گوێرەی ئەو زانایەی لەوێ (فتوا)ی ئەدا- مەزهەبێکی لێ بڵاو بۆوەو خەڵکەکە بە گوێرەی ئەو مەزهەبە لە قورئانو حەدیس تێدەگەشتن. کوردستانی پارچەکراومان بووە شوێنکەوتەی مەزهەبی ئیمامی(الشافعي)ﷺ، هەروەك لە پێناسەکەیدا باسمان کرد.

ئەی لاوی موسوڵمان: کە ئیمام (مالك) کتێبی (الموطأ)ی دانا، خەلیفە (هارون الرشید) پێی گوت: دەمەوێ ئەم خەڵکە بە گشتی ڕەفتار بە (الموطأ) بکا-واتە: بێنە سەر مەزهەبی تۆ- ئیمام (مالك) فەرمووی: ئەمە نابێ، چونکە (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ هەر یەکە بەرەو شوێنێكو شارێك ڕۆیشتونو حەدیسی پێغەمبەریانﷺ گێڕاوەتەوە، کەوابوو: خەڵکی هەر شوێنێك جۆرە زانستێکی ئایینیان لە لایە. بڕانە (نور الابصار) ل(٢١٠).

ئەی لاوی موسوڵمان: بڕوانە هەڵوێستی دادپەروەرانەی ئەم ئیمامە بەڕێزە:

١- نایەوێ خەڵك بە زۆرەملە بهێندرێتە سەر مەزهەبی ئەوی.

٢- هەروەها ڕێگەش نادا خەڵك لە مەزهەبی دانیشتووانی شوێنی خۆیان لابدرێن، تاکو پەرتەوازە ڕوو نەدا.

ئەی لاوی موسوڵمان: ئێستا دڵنیام بنچینەی مەزهەبو (تقلید)ت بۆ ئاشکرا بوو، لە مەودوا بە قسەی سەر قۆزو بن ئاڵۆزی فەریکە خوێندەوارانی (دارا دوو داری دووری دی) هەڵناخەڵەتێیو شوێن نامیلکۆکەی ڕەنگاو ڕەنگ ناکەوی- إن شاء الله تعالى-.

## ﴿ مەزهەبی ئیمامی (الأشعري) ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: وا بەخۆت دەبینی (خوارج) چۆن دژایەتی مەزهەب (الأشعري) دەکەن، بە جۆرێکی وەها گەنجەکانیان تەفرە داون: کە وشەی (أشعري) بووەتە جنێوی سەر زوبانیان، ئەگەر بیانەوێ تۆمەت بدەنە پاڵ یەکێك پێی دەڵێن: (فلان کەس مرۆڤێکی خراپە؟ چونکە (أشعري)یە ! ! !). یان دەڵێن: (فلانەکەس (عقیدة)ی خراپە؟ چونکە (أشعري)یە ! ! !).

ئینجا ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوا منیش -بە پشتیوانی خوای گەورە- نەژادو مەزهەبی (أشعري)ت بۆ ڕوون دەکەمەوە:

### ١- بنچینەی نەژادی ئیمامی (الأشعري):

ئیمام (أبوالحسن الاشعري) ناوی (علي بن اسماعیل بن اسحاق بن سالم بن اسماعیل بن عبدالله بن موسى بن ابيبردة بن أبي موسىالاشعريﷺ) رواه ابن عساكر عن البيهقي.

واتە: باپیرەی هەشتەمی ئیمامی(الأشعري): کە ناوی (أبوموسى الاشعري)یە، یەکێکە لە (صحابة)کانی پێغەمبەرﷺ، ئەم بەڕێزە لەگەڵ خزمەکانی خۆی ویستیان بێنە (مدینة)و

موسوڵمان ببن، سواری کەشتی بوونو لە ناو دەریادا ڕێگەیان لێ گۆڕاو چونە (حَبَشَة)، لەوێ لەگەڵ حەزرەتی (جعفر بن ابی طالبؓ)-کە کوڕە مامی پێغەمبەرﷺ بوو- یەکتریان دیتو بە یەکەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ، لەو کاتەی لە (غەزا)ی (خیبر) بوو، پێغەمبەرﷺ لە دەستکەوتی (خیبر) بەشداری کردن، بڕوانە (البخاری ومسلم).

## ٢- ڕێزداری ی باپیرەی (الأشعري).

حەزرەتی (أبوموسی الاشعری) ئەم بەرەکەتەی لە پێغەمبەرﷺ وەرگرتوە: کە پێغەمبەرﷺ داوای جامە ئاوێکی کردو دەستو رووی پیرۆزی خۆی تێدا شوشتو نەختێکی ئاوەکەی لە دەمی پیرۆزی خۆی وەرداو ڕشتیەوە ناو جامەکە، ئینجا فەرموویە (بلال الحبشی)و (أبوموسی الاشعری): لەم ئاوە بخۆنەوەو بیرژێننە سەر روو و سینەتانو موژدەی پیرۆزیتان لێ بێ. ئینجا ئەم دوو (صحابة) بەڕێزەش فەرمانی پێغەمبەریانﷺ جێ بەجێ کرد. بڕوانە (البخاری ومسلم).

واتە: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: لە سەر پاکیو ڕێزداری ی نەژادی ئیمامی (الأشعري)، چونکە باپیرە گەورەکەی ئیمامی (أشعری) بەرەکەتی لە پێغەمبەرﷺ وەرگرتوەو زۆریش ڕێزدار بووە لە لای پێغەمبەرﷺ. بڕوانە (شرح صحیح مسلم بهامش القسطلاني)ل(٣٩٢) ب(٩).

## ٣- ڕێزداری ی هۆزی (الأشعري).

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِىاللهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَىالْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَىالْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ-(المائدة:٥٤-، لَمَّا نَزَلَتْ هذه الآيَةُ أَشَارَ النَّبِيُّﷺ إلى أبىمُوسىالأشْعَرِي وقالَ: هُمْ قَوْمُكَ يا أبامُوسى ﴾ رواه الحاكم وابن عساكر، وقال: قال أبو عبد الله الحافظ: هذا حديث صحيح. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە ئیسلام، هەر کەسێك لە ئێوە لە ئاینی ئیسلام وەرگەڕێتەوە، خوای گەورە لە مەودوا گەلێکی وەها دەهێنێ: خۆشی دەوێنو ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ، بەرامبەر ئیمانداران ملکەچنو بەرامبەر کافرەکان بەهێزن، لە ڕێگەی خوا (جهاد) دەکەنو لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك ناترسێن، ئەو سیفەتە باشانە گەورەییێكو ڕێزلێنانێکی خوایە دەیداتە ئەو کەسانەی حەز بکا، خوای گەورە دەوڵەمەندێکی فراوانەو زانایە. ئینجا پێغەمبەرﷺ بە (أبوموسی الاشعری)ی فەرموو: مەبەست بەم گەلەی لەم ئایەتەدا باس کراوە: گەلەکەی تۆیە، واتە: هۆزی (الاشعری). بڕوانە (تبیین کذب المفتري) ل (٦٢).

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ إنَّ الأشْعَرِيِّينَ إذا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ أَوْ قَلَّ طَعامُ عَيالِهِمْ بالْمَدِينَة جَمَعُوا ما كانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ واحِدٍ ثُمَّ اقْتَسَموهُ بَيْنَهُمْ فِي إناءٍ واحدٍ بالسَّوِيَّة، فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ ﴾رواه البخاري ومسلم، واتە: هۆزی (الاشعری) کاتێ خواردەمەنییان کەم دەبێتەوە لە (غەزا)، یان لە ماڵەوە، هەڵدەستن بە تێکڕایی ئازوقەی خۆیان تێکەڵ دەکەن، ئینجا بە یەکسانی لە قاپێکدا بەشی دەکەن-واتە: تاکو هەژارەکانیشیان ببنە خاوەن ئازوقە- جا پێغەمبەرﷺ لە بەر ئەم سیفەتە چاکە فەرمووی: ﴿ فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ ﴾، واتە: هۆزی (الاشعری) لە منن، منیش لەوانم.

جا ئەی لاوی موسوڵمان: ڕێزداری لەوە گەورەتر هەیە: کە پێغەمبەرﷺ هۆزی(الأشعري)ی بە هۆزی خۆی داناوە، خۆیشی بە هۆزی(الأشعري) داناوە؟ ڕاستە: هۆزەکەی پێغەمبەرﷺ (قریش) بووەو بەرێزترە لە هۆزی (الأشعري)، بەڵام هەر کاتێك پێغەمبەرﷺ هۆزێکی گەورە کردبێ، بە ڕقو قینەی ناحەزان نزم نابێتەوە.

## ٤- بەسەرهاتی مەزهەبی (الأشعري):

جا ئەی لاوی موسوڵمان: کاتێك ئەم ئایەتو حەدیسانە بۆ (خوارج)و (مُجَسِّمَة)ی ئەم سەردەمە دەخوێنیەوە، پێت دەڵێن: خۆ ئێمە دژی ئیمامی(الاشعری)نین، بەڵکو ئێمە دژی مەزهەبی(أشعری)یەکانین. هەروەها پێت دەڵێن: (ئیمامی أشعری) لە مەزهەبی خۆی پەشیمان بۆتەوە، ئەم خەڵکە بە هەڵەدا چووەو شوێن مەزهەبە کۆنەکەی کەوتون.
جا ئەی لاوی موسوڵمان: با لە پێشدا بەم جۆرە کەسانە بڵێین: (ئێوە وەکو بزن فرۆش دەڵێن: شەل نیە، بەڵام قاچی شکاوە)!!!.

ئینجا بەسەرهاتی مەزهەبی (الاشعری) ڕوون دەکەینەوەو دەڵێین: ئیمام (أبوالحسن الاشعری) لە ساڵی (٢٦٠)ی کۆچی لە (بصرة) لە دایك بووەو لە ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی لە (بغداد) وەفاتی کردوە، کەواتە: ئیمامی (الاشعري) بە زانایەکی (سَلَف) دەناسرێ، چونکە لە سەدەی سێیەمی (سَلَف)دا ژیاوەو تەمەنیشی درێژ بووە، تا (٢٣) ساڵیشی لە سەردەمی (خَلَف) تەواو کردوەو بەرگری لە (عقیدة)ی ئیسلام کردوە.
ئیمامی (الاشعري) لە پێشان (معتزلة) بوو، ئینجا خوای گەورە ڕەحمی پێکردو هاتەوە سەر مەزهەبی (اهل السنة والجماعة)، ئیمامی (الاشعري) خۆی دەفەرموێ: لەو کاتەی (معتزلة) بووم، لە خەونمدا پێغەمبەرمﷺ دیتو پێی فەرمووم: (ئەو ڕێبازە بگرەبەر کە من فەرمانم پێکردوی، چونکە هەر ئەم ڕێبازە ڕاستەو ئایینی منە). ئینجا گەڕامەوە سەر مەزهەبی (اهل السنة)و دەستم بە کتێب دانان کردو یارمەتی (أهل السنة)م دا.
بەم جۆرە ئیمامی (الاشعری) بووە ئیمامی (أهل السنة والجماعة) لە (عقیدە)دا، ئەو کتێبانەی تا سێ ساڵ پێش وەفاتکردنی دایناون: ژمارەیان لە دوو سەد کتێب زیاترە،

یەکێکیان (تفسیر)ی قورئانی پیرۆزە: لە حەفتا بەرگدا، بەڵام بە داخەوە: ئێستا ئەم تەفسیرە دەست ناکەوێو هەندێ کەس تۆمەت ئەدەنە پاڵ (معتزلة): کە ئەوان سوتاندویانەو لە ناویان بردوە، زۆربەی کتێبەکانی تریشی لە (حدیث)و (عقیدة)و ڕەددانەوەی (أهل البدعة)یە. بڕوانە کتێبی (تبيين كذب المفتري) ل(٤٣)و (١٢٨)و دواوەتر.

جا ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوە (ألأشعري)ت ناسیو زانیت کام زانای ڕەسەنو ڕێزدارە، دڵنیابە: ئیمامی(الاشعری) لە عەقیدەدا پێشەوای (اهل السنة والجماعة)یە، جا ئەگەر (خوارج) پێیان گوتی: (مەزهەبی (الاشعری) ڕاست نیە). یان گوتیان: (ئیمامی (اشعری) لە مەزهەبی خۆی پەشیمان بۆتەوەو ئەم خەڵکە بە هەڵەدا چووەو شوێن مەزهەبەکەی کۆنی کەوتون). لە وەڵامی دا بڵێ: ئەی برای بەڕێزم: پێچەوانەکە ڕاستەو جەنابت بە هەڵەدا چوی، چونکە ناگونجێ ئەم هەموو ئیمامانە گشتیان بە هەڵە لە سەر مەزهەبی (أشعری) بوبن، وەکو:

(الحاكم) خاوەنی(المستدرك)و ئیمام (فخر الدين الرازی) خاوەنی(التفسير الكبير)و (إبن فورك)و (إبن عساكر المحدث الدمشقی)و (القاضی عبدالوهاب المالكی)و (الامام البيهقی)و (أبوذر المالكی)و (امام الحرمين)و (الامام الغزالی)و (الخطيب البغدادی)و (الامام المازری)و (الامام النواوی): دانەری(شرح صحيح مسلم)و (إبن حجر العسقلاني): دانەری(فتح الباری شرح البخاري)و (الامام القسطلاني): دانەری(ارشاد الساری شرح البخاری)و (الامام جلال الدين السيوطي)و ئیمام (زكريا الانصاری): دانەری(تحفه الباری شرح البخاری)و (إبن حجر الهيتمي) دانەری(تحفة المحتاج)...جگە لەمانەش: چەند زانایەکی تر .

ها ها: ئەوانە (أشعری)یەکانی منن، ئەوانە لە سەر ڕێبازی ڕاستی پێغەمبەرنﷺ، زانستی ئیسلام لەو زانایانەو لە وێنەی ئەوان وەردەگیرێ، جا هەر کەسێك ئەم زانا بەڕێزانە بە گومڕا دابنێ، خۆی گومڕایەو ڕێگەی دۆزەخی گرتۆتە بەر، توخوا وەرە وەرە کتێبی (تبيين كذب المفتری فيما نسب للامام الاشعری) بخوێنەوە، تاکو بزانی (اشعری) کێ یەو (اشعری)یەکان کێن؟ هەروەها بڕوانە (مفاهيم يجب أن تصحح) ل(٥٠و ١١١) چاپ ٣.

جا ئەی لاوی موسوڵمان: بە (خوارج)و (مجسمه)کان بڵێ: ئەگەر بەم ئیمامە بەڕێزانەش تەمبێ نابن، ئەوا بە (صلاح الدين الايوبی)ی کوفربەزێن مەیدانتان لێ دەگرمو بەرەو مەیدانی گومڕایی (صليبية) ڕاوتان دەنێمو نامێلکۆکەی ڕەنگاوڕەنگیش فریاتان ناکەوێ:

الدکتور (محمد عياش الكبيسی) دەفەرموێ: ((صلاح الدين الايوبي) بە دوای ڕێگایەکی وادا گەڕا: کە بتوانێ متمانە بداتە هەموو کەسێكو گیانی پەرتەوازەیی بمرێنی لە دڵی جیاوازاندا، ئینجا مەزهەبی (الاشعري)ی هەڵبژارد و خەڵکیش ئەم هەڵبژاردنەی

قبولْ كرد، پێكهاتن گشت لایەكی گرتەوە-مەگەر ئەو كەسەی خوا حەزی كردبێ پێك نەیێ- ئەم ئوممەتەی ئیسلام نزیكەی هەمووی هاتە سەر یەك مەزهەبی عەقیدەیی...ئینجا دەفەرموێ: ئەمە بووە هۆی بلاوبوونەوەی مەزهەبی (الاشعري) بە جۆرێكی وەها: مەزهەبەكانی تر لە بیر چونو مەزهەبێكی تریجیاواز نەما- مەگەر مەزهەبی(الحنبلي)- جا مەزهەبی(الاشعري) تەنها بە پشتگیری سولتان ئەم سەركەوتنەی وەدەست نەهێنا، چونكە ئەگەر وابووایە، هەر بە نەمانی سولتان ئەم مەزهەبە لە ناو دەچوو، بەلام ئەم مەزهەبەی(الاشعري) تەبیعەتی وەهایە: گیانی هەستی مەزهەبی دەگوژێو مەزهەبێكی پێكهێنەرەو ناوەنجیە). بڕوانە (العقيدة الاسلامية فى القرآن الكريم ومنهاج المتكلمين) ل(١٩) چاپی (١).

بەڵێ: (اشعَرِي)یەكان ناوەنجین لە نێوان (معتزلة)و (حشوية)دا، وەكو (معتزلة) لە قورئانو حەدیس دوور نەكەوتونەوەو وەكو (حشوية)ش لە عەقڵ دوور نەكەوتونەوە، چاكەی پێشینەی خۆیان بە میرات وەرگرتوەو وازیان هێناوە لە باوەڕە پوچەڵەكانی گشت گرۆهێك، ئەو باوەڕەی پێغەمبەروﷺ (صحابة)كان لە سەر بوون پاراستویانەو دونیایان پڕ زانست كردوە. بڕوانە (پێشەكی ی بلاوكەرەوەی (تبيين كذب المفترى) ل(١٩) چاپی(١).

تازە بە تازە، فەریكە خوێندەواری سەرلێشێواو دەیەوێ بمانشێوێنێو بە هێزی (دولار) لە مەزهەبی(الاشعری) لامانبداو بمانخاتە گێژاوی (خوارج)و (مجسمة)، تاكو متمانەمان بە (شرح مسلم)و (فتح البارى) نەمێنێو شوێن (صلاح الدين )ێكی تر نەكەوین بۆ سەربەرزكردنەوەی ئیسلام، بە خوا خەیاڵتان خاوە.

## ﴿ گرۆهی ( خَوارِج ) ﴾

جا ئەی لاوی موسوڵمان: تكایە ئەم باسە بە وردی بخوێنەوە، تاكو بزانی: (خوارج) گرۆهێكن لەو حەفتاو دوو گرۆهەی گومڕابوو و لە سەردەمی (خلافة)ی ئیمامی (علی)دا‌ رضي الله عنه خۆیان ئاشكرا كرد، ئەوان ناویان لە خۆیان نابو: (شُراة)، واتە: بەهەشت كڕ، یان خۆفرۆش بە خوای گەورە، بەلام موسوڵمانان ناویان لێنان: (خَوارِج)، واتە: دەرچووەكان لە كۆمەڵی (السنة والجماعة).

بنچینەی (خَوارِج) دەگەڕێتەوە سەر پیاوێكی بێئەدەب كە لە سەردەمی پێغەمبەرﷺدا بوو، ناوی (حرقوص) بوو، پێیان دەگوت: (ذُوالخُوَيْصرَة). پێغەمبەرﷺ شتێكی لە نێوان موسوڵماناندا بەش دەكرد، ئەم بێئەدەبەش گوتی: (يارَسُـولَ الله إتَّـقِ الله، يارَسُـولَ الله إعْدِلْ) ئەی پێغەمبەری خوا لە خوا بترسە، دابەروەرانە ئەم شتە بەش بكە. جا

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (کێ دادپەروەرە ئەگەر من دادپەروەر نەبم؟). ئینجا ئیمامی (عمر)و حەزرەتی (خالد بن الولید) فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ڕێگەم بدە: تاکو لە ملی بدەم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنە، چونکە لە بنچینەی مەزهەبی وی کۆمەڵێك دەردەچن: قورئان دەخوێننو لەگەردەنیان تێناپەڕێ، موسوڵمانان دەکوژنو واز لە کافران دەهێنن، ئەگەر من بمێنم وەکو گەلی (عاد) لە ناویان دەبەم...تا کۆتایی ئەم سێ حەدیسانەی داهاتوو کە لە (بخاری ومسلم)دا گێڕدراونەوە.

ئینجا لەو کاتەی ئیمامی(علیؓ)و حەزرەتی(معاویةؓ) سولحیان کردو بڕیاریان دا: لێژنەی (التحکیم) دابندرێ، حەزرەتی (أبوموسیالاشعری) بووە نوێنەری ئیمامی(علی) لەم لێژنەیەدا، کۆمەڵێکی سەرلێشێواو-کە ژمارەیان (١٢٠٠٠) کەس بوو- لە لەشکری ئیمامی (علیؓ) جیا بونەوەو دروشمی (لا حُكْمَ إلاّ للّه)یان ئەگوتو تۆمەتی کافربوونیان دەدا پاڵ ئیمامی (علیؓ)-چونکە بە دانانی لێژنەی (التحکیم) ڕازی بووە- ئەیانگوت: پێویستە (علی) لە (کفر)ەکەی خۆی تۆبە بکا-وەکو ئێمە- ئینجا دەگەڕێینەوە ناو لەشکری (علی).

ئینجا ڕۆژێك ئیمامی (علیؓ) ووتارێکی داو ڕەخنەی لە (خوارج) گرت، ئینجا چەند کەسێکی (خوارج) ڕووبەڕووی هەڵسانو گوتیان: (لا حُكْمَ إلاّ للّه)، واتە: بڕیاردان تەنها مافی خوایە. ئینجا ئیمامی (علیؓ) وەڵامی دانەوەو فەرمووی: (كَلِمَةُ حَقّ أُريدَ بِها باطِلٌ) ئەمە ووشەیەکی ڕاستە، بەڵام مەبەست بە مە کارێکی ناڕەوایە. ئینجا فەرمووی: جارێ سێ مافتان لە لای ئێمە هەنە:

**یەکەم:** لە مزگەوتەکان قەدەغەتان ناکەین کە زیکری خوای تێدا بکەن.

**دووەم:** لە دەستکەوتەکانی ئیسلام بێبەشتان ناکەین تا لەگەڵ ئێمەدا بن.

**سێیەم:** جەنگتان لەگەڵ ناکەین تا جەنگمان لەگەڵ نەکەن.

ئیتر (خوارج) لە کارە ناڕەوایەکانی خۆیان بەردەوام بوون بە شێوەیەکی وەها: خۆیان لە شتی کەم دەپاراست، بەڵام گەورەترین شتی ناشیرنیان دەکرد:

**بۆ نموونە:** ڕۆژێك (عبدالله بن خباب بن الأرت) خۆیو ژنەکەی گەیشتنە کۆمەڵێکی (خوارج)و دیتی یەکێکیان لە بن دارخورمایەك دانە قەسپێکی خستە ناو دەمی خۆی، بەڵام هاوڕێکانی خۆیان لێ زویر کرد، چونکە بە بێئیزنی خاوەنەکەی خواردویەتی.

هەروەها: یەکێکیان بەرازێکی کوشت، دیسان خۆیان لێ زویر کرد؟ چونکە خواردنی گاورێکی (ذمّي)ی لە ناو بردوە. ئینجا ڕوویان کردە (عبدالله)و پێیان گوت: بڕوات چۆنە بەرامبەر(علی)؟ ئەویش وەڵامی دانەوەو گوتی: (علی) لە سەر ڕێگەی ڕاستەو ئەو لە ئێوە شارەزاترەو بەترسترە بۆ ئایینی ئیسلام. ئیتر کە (عبدالله) ئەم وەڵامەی دانەوە، لە پێش چاوی ژنەکەی کوشتیانەوە، ئینجا زگی ژنەکەشیان هەڵدڕیو-بە کۆرپەکەی ناو زگیەوە- کوشتیان.

بەڵێ: بەراز کوشتنیان پێ حەرامە، بەڵام کوشتنی موسوڵمانێکی کوڕە (صحابة)ی پێغەمبەریانﷺ پێ حەڵاڵە ! ! !.
ئیتر کە ئیمامی (علیﷺ) ئەم کارەساتەی زانی، خۆی بۆ ئامادەکردن و داوای لێ کردن: بکوژە تاوانبارەکانی تەسلیم بکەن، بەڵام (خوارج) وەڵامیان داوەو گوتیان: ئێمە بە گشتی (عبدالله)و ژنەکەمان کوشتوە، چونکە ئێوە ماڵ و کوشتنتان حەڵاڵە، ئینجا کە (خوارج) زانییان ئیمامی (علیﷺ) وازیان لێ ناهێنێ، بەرە بەرە بڵاوەیان کرد، بە شێوەیەکی وەها: لەم دوانزە هەزارە، تەنها چوار هەزاریان هاتنە مەیدانی ئیمامی (علیﷺ)، ئەوانەش لە ماوەیەکی کەمدا کوژران و تەنها نۆکەس توانییان دەرباز ببن.
جا لە ئەنجامدا کۆمەڵێکی (خوارج) بڕیاریان دا: ئیمامی (علی)و (معاویة)و (عمرو بن العاص)رضی الله عنهم بکوژن، ئینجا (عبدالرحمن بن ملجم) تەرخان کرا: بۆ کوشتنی ئیمامی (علیﷺ)، ئینجا هەر لە پێش دەرگەی خۆی، لە بەرەبەیانی هەینی (١٧)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی(٤٠)ی کۆچی، (عبدالرحمن بن ملجم)ی (خوارج)ی ڕووڕەش شمشێرێکی لە سەری ئیمامی(علی) داو بەم برینە سەختە لە ڕۆژی یەکشەممەدا وەفاتی کرد–إنا لله وإنا إليه راجعون–. بۆ زێدە زانستی ئەم باسە، بڕوانە (نور الابصار) ل(٩٨)و٩٩ و١٠١و ١٠٢ و١٠٤) هەروەها (الخلفاء الراشدون)ل(٤٣٠)و (٤٤٢)و (٤٤٥).
﴿ **ئاگاداری** ﴾: بەشداربوونی حەزرەتی(أبوموسى الاشعرى) لە لێژنەی(التحكيم)، بووەتە هۆی دژایەتی (خوارج) لەگەڵ هۆزی (الاشعري)و مەزهەبی (الأشعري)، چونکە ئیمامی (الاشعري) لە نەتەوەی ئەم (صحابة) بەڕێزەیە.

## ﴿( خَوارج )ەکانی ( وَهابي )﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: خۆ بە شەهیدکردنی ئیمامی(علیﷺ)، (خوارج) نەیانتوانی دەسەڵات وەربگرن، بەڵکو تەنها هەر خەریکی ئاژاوە بون لە دژی دەوڵەتی ئیسلام، جا کاتی وا دەهات هەر ناویان نەئەما، چونکە تەبیعەتی(خوارج) ئەوهایە: پەیدا دەبن و دەبڕێنەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَنْشَأُ نَشْأٌ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لايُجَاوِزُ تَراقِيَهُمْ، كُلَّما خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ، قالَ ابْنُ عُمَرَﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: كُلَّما خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ أَكْثَرَ مِنْ عِشْرِينَ مَرَّةً، حَتَّى يَخْرُجَ فِي عِراضِهِمُ الدَّجَّالُ ﴾رواه ابن ماجه بسندصحيح، چینە خەڵکێك پەیدا دەبن: قورئان دەخوێنن و لە گەردەنیان تێناپەڕێ، هەر چینێکیان دەردەچێ، دەبڕێندرێتەوە، –زیاتر لە بیست جار وەهای فەرموو– تا لە مەیدانی ئەواندا (دَجَّال) دەردەچێ.
جا لە سەرەتای سەدەی دوانزەمی کۆچی دا جارێکیتر سەریان هەڵداوەو بە سەرکردایەتی (محمد بن عبدالوهاب) هاتنەوە مەیدانی ئاژاوەو ململانە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلام، بەو جۆرەی باسی دەکەین:

ئینجا ئـەوەش بزانـە: ئـەم جـارە (خـوارج) ناویـان لـە خۆیـان نـا: (المُوَحِّدُون)، واتـە: یەکخواپەرست. بەڵام موسوڵمانان ناویان لێنان: (وهـابی)، واتـە بـە نـاوی (عبـدالواهاب)ی باوکی سەرکردەکەیان ناویان دەهێنان.

## ﴿ پەیوەندی (إنگلیز)و (وَهابِي)یەکان ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: دامەزرێنەری ئەم گرۆهە گومڕابووە—کە نـاوی (محمـدبن عبـدالوهاب) بوو— لە ساڵی (١١١١)ی‌کۆچی لە دایك بوو، لـە سـاڵی (١٢٠٦)دا مـرد، یەکـەم جـار قوتـابی ئایینی بوو، لە (مدینة)ی پیرۆز دەیخوێنـد، بـەڵام هـەر لـەوێ گومڕاییـەکانی خـۆی ئاشـکرا دەکردن، تـا وای لێهـات: مامۆسـتایەکانی خـۆی‌و (الـشیخ سـلیمان)ی بـرای خـۆی ڕەدیـان دەداوەو کتێبیان لە دژی وی دانان، ناچار ڕووی کردە لای ڕۆژهەڵاتی(مکة)و (المدینة)، لەوێ پەیوەندی بەست: لەگەڵ (محمد بن سـعود) ئـەمیری(الدرعیـة): کـە لـە هۆزەکـەی(مـسیلمة الکذاب) بوو، تاکو یارمەتی ی بدا بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی، کە دەیگوت: (ئەم خەڵکە ماوەی شەشسەد ساڵە کافرەو پێویستە بهێندرێنەوە سەر یەکخواپەرستی).

جا هەر کەسێك شوێنیان کەوتبا، فەرمانیان پێ‌دەکرد: سەری بتاشێ، واتـە: چـونکە تـا ئێستا کافر بووەو تازە بۆتەوە موسوڵمان‌و دەبی مووی کوفر لە خۆی لابـدا، ئینجـا کـە (محمد بن سعود) مرد، (عبدالعزیز)ی کوڕی لە جێ‌ی دانیـشت‌و یارمـەتی‌ی دەدا، بڕوانـە (الفتوحات الاسلامیة) ل(٢٥٧و٢٥٨) و(الدرر السنیة) ل(٣٩) تا(٥٤).

ئەی لاوی موسوڵمان: بەم سەرتاشینەی(وهابی)یەکان حەدیسی پێغەمبەرﷺ هاتـە جـێ، کە دەفـەرموێ: ﴿ يَتِيهُ قَوْمٌ قِبَلَ الْمَـشْرِقِ مُحَلَّقَـةٌ رُؤُوسُـهُمْ ﴾رواه مـسلم، لـە لای ڕۆژهەڵاتی (مدینة)ی پیرۆز، کۆمەڵێك لە ڕێی ڕاست لادەدەن‌و گومڕا دەبـن، نیشانەیان ئەوەیـە سەرتراشـکراون. بڕوانـە (شـرح مـسلم بهـامش القـسطلاني) ل(٣٥)ب(٥) و(روضة المحتاجین ) ل(٤٠٣).

ئینجا دەوڵەتی (إنگلیز)ی‌کافر دەستی کرد بە یارمەتیدانی (وهابی)یـەکان لـە ڕێگـەی ئـەم (عبدالعزیز بن محمد بن مسعود)ەوە، ئەوەندە چەك‌و ماڵی بۆ ناردن تا وایان لێهات کەوتنە جەنگ لە دژی (خلیفە)ی ئیسلام، بە پشتیوانی(إنگلیز) ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ لەشـکری دەوڵەتی ئیسلام، بۆ بەرژەوەندی (إنگلیـز) چـەند شـارێکی ئیـسلامیان داگیـر کـرد: وەکـو (مکة)و (مدینة)و (کویت)...هتد. بڕوانە (کیف هدمت الخلافة) ل(١٣)و (١٤).

ئەی لاوی موسـوڵمان: بـە خـۆت بـاش دەزانـی ئێـستاش پەیوەنـدی نێـوان (إنگلیـز)ی ئاغـاو (وهابی)یەکانی نۆکەر پتەوترە لە جاری پێشوو، بە زەیی‌و پەیوەندی نێوانیان زۆر بـەهێزترە لـە بـەزەیی‌و پەیوەنـدی ی نێـوان دایـك‌و کیـژ، فـەرموو: بـە چـاوی خـۆت دیتـت، لە ساڵی (١٩٩٠)ز، بەرامبەر (١٤١١)کۆچی، حیزبی بەعسی عێراقی دەستی بە سەر (کویـت)دا

گرتو ویستی بەرەو (سعودیة)ش بڕوا، یەکسەر کافرەکانی (إنگلیز)و (أمریکا)و (فرنسا) هاتنە هاواری بنەماڵەی (آل سعود)ی(وهابی)، زانایانی ئاینی (وهابی)ش (فتوا)یان دا: کە (دروستە لە دژی عێراق پشت بە کافران ببەستریؒو موسوڵمانانی عێراق بە دەستی کافرەکان بکوژرێن)!!!.

ئەی لاوی موسوڵمان: بە چاوی خۆت دیتت: (موشەك)و (فڕۆکە)ی ئەم سێ دەوڵەتە کافرانە چۆن شارەکانی ئیسلامیان-لە عێراق- بۆمبباران دەکردو سەربازو ژنو منداڵو پیری موسوڵمانیان لەت لەت دەکرد، بە جۆرێکی وا: ژمارەی کوژراوی موسوڵمانانی عێراق-کوردو عەرەبو کەمایەتیەکانیتر- گەیشتە (٨٥) هەزار.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە دەبینین: جووەکان -بە یارمەتی ئینگلیز- خاکی (فلسطین)یان داگیر کردوە، بەڵام تا ئێستا (وهابی)یەکانی(سعودی) یەك فیشەکیان بەرامبەر جووەکان نەتەقاندوە-جگە لە مەش- (إبن باز)ی (وهابی) فتوای دا: کە پێکهاتن لەگەڵ جووە داگیرکەرەکانی (فلسطین) دروستە. ئەوەش بە هۆی ئەوەیە: جووەکانو (وهابی)یەکان هەردووکیان نۆکەری (انگلیز)ن، بەڵێ ڕاستە: کە پێغەمبەرﷺ دەربارەی (خوارج) دەفەرموێ: ﴿ يَقْتُلُونَ أَهْلَ ٱلإسْلامِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ ٱلأوْثَـانِ ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: موسوڵمان دەکوژنو واز لە کافرەکان دەهێنن.

ئەی لاوی موسوڵمان: بە چاوی خۆت دیتت: لە ساڵی (١٩٨٨)ز، بەعسی عێراقی-کە حیزبێکی (علماني)ی (صلیبي) بوو و خۆی بە سەر عێراقدا سەپاندبو- کوردستانی کیمیاباران کردو پێنج هەزار مزگەوتو چوار هەزار گوندی ڕوخاندو زیاتر لە (١٨٠) هەزار کوردی موسوڵمانی کوشتنو شوێن بزری کردن، بەڵام کەس فرمێسکێکی بۆ نەڕشتن؟ -چونکە وەکو (وهابی)یەکانی(سعودی) نۆکەری (إنگلیز)و (فرنسا)و (امریکا) نەبون- کەس نەیگوت: کوردە ماڵت لە کوێیە؟.

ئێستاش بە هۆی تاوانی بەعسی عێراقو بە (فتوای)ی (وەهابی)یەکان: شەش ساڵ زیاترە کورد لە برسیەتی داو لە ژێر باری گەمارۆی ئابوری دا دەژینو خاکی کوردستانی ئازیز-وەکو خاکی (حجاز)- بووەتە بنکەی کافرەکانی (فرنسا)و (إنگلیز)و (أمریکا)و کافرەکانی تر، هەموویان شان بەشانی (وەهابی)یەکان، گەلی کورد بەرەو گومڕایی دەبەن، (اللهم اليك نشكو ضعف قوّتنا وقلة حيلتنا وهواننا على الناس يا أرحم الراحمين انت رب المستضعفين).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەو کارەساتەی (محمد بن عبدالوهاب)ی گومڕابوو-بە پشتیوانی (عبدالعزیز)ی (آل سعود)- بە دەوڵەتی ئیسلامی کردوە، نایەتە نووسین، چونکە هەر شارێكو هەر گوندێکیان داگیر کردبایە، تاڵانیان دەکردو ژنو منداڵیان دەکوشتنو

گومبەتی گۆڕی پیاوچاکانیان دەڕوخاندو لە هەندێك شوێن دەیانکردنە ئاودەستخانە،

لە ناو مزگەوتدا موسوڵمانیان دەکوشتن:

جارێك بانگدەرێکی کوێریان بە فەرمانی (محمد بن عبدالوهاب) کوشت، چونکە لە دوای بانگ سەڵاواتی لە سەر پێغەمبەر داﷺ، ئینجا (محمد بن عبدالوهاب) گوتی: (دمبکچی لە ماڵی قەحپەدا، تاوانی کەمترە لەو بانگدەرەی لە سەر منارەی بانگ سەلاوات لێ دەدا).

چەندەها کتێبی ئاینییان دەسوتاندو لە کۆڵانان فڕێیان دەدا، خەڵکیان قەدەغە دەکرد لە زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ، هەروەها لە بەرچاوی ئەودا دیانگوت: (عَصَايَ خَيْرٌ مِنْ مُحَمَّدٍ) دارعەسایەکەی من لە پێغەمبەرﷺ بە سودترە؟ چونکە پێغەمبەرﷺ مردوەو هیچی لە دەست نایێ. ئەم هەمووکارە ناڕەوایانەیان دەکرد، لە ژێر دروشمی بانگەوازی بۆ یەکخواپەرستیو خۆپاراستن لە (شرك). بۆ باوەڕکردنو دڵنیایی لەم باسە، بڕوانە (الدرر السنية) ل(٤١ تا ٥٤) و(الفتوحات الإسلامية) ل(٢٥٦ تا ٢٦٩) ب(٢) و(روضة المحتاجين) ل(٣٨٤و ٣٨٥).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئا ئەمەیان ئەو (محمد بن عبدالوهاب)یە: کە (خوارج)ی ئێستا بە (شيخ الاسلام)و بە (مُجدّد دين الاسلام)و بە (بطل التوحيد) ناوی ئەهێننو ئەیانەوێ گەنجەکانی موسوڵمان لە هەر چوار مەزهەبی (أهل السنة) لابدەنو بیانهێننە سەر مەزهەبی (محمد بن عبدالوهاب)ی پاڵەوانی ئاژاوەو تێکدەری دەوڵەتی ئیسلام.

ئەی لاوی موسوڵمان–بۆ خاتری خوا–تکات لێ ئەکەم: ڕێبازە پیرۆزەکەی (محمد بن عبدالله)ی پێغەمبەرتﷺ گوم نەکەیو شوێن ڕێبازە چەوتەکەی (محمد بن عبدالوهاب) مەکەوە!.

بەڵێ: هەر (محمد بن عبدالوهاب) بوو–لە ڕێگەی (همفر)ی (جاسوس)ی(إنگليزی)–پەیمانی لەگەڵ کافرەکانی(إنگلين)دا بەستو دەوڵەتی ئیسلامی بێهێز کرد، جا بەم بێ هێزکردنە ڕێگەی بۆ کافرەکانی(إنگلين)و کافرەکانی تری ڕۆژئاوا ئاسان کرد: تاکو بتوانن دەوڵەتی ئیسلام پارچە پارچە بکەنو لە (٣) ی (ئازار)ی (١٩٢٤)ز، (خلافة)ی ئیسلام هەڵبوەشێننو موسوڵمانان بە (یتیم)یو بە بێ(خليفة)، سەرگەردان بن.

بەڵێ: کوردستانیش–وەك بەشەکانی تری دەوڵەتی ئیسلام– بە بڕیاری (سایکس–بیکو)ی کافرەکانی (إنگلين)و (فرنسا): پارچە پارچە کراو بە سەر وڵاتەکانی دراوسێدا بەش کرا، إنا لله وإنا إليه راجعون. بڕوانە (كيف هدمت الخلافة) ل(١٣و١٤)و (٩٣ تا ٩٧).

**پشت لە دین کردن–براکەم–پێم بڵێ: سودی چ بوو؟**

**یان بە لات وابوو کە ئایین بویتە مەنعو بەرگری**

**سا بە (وَالله) عارە هەرگیز پشت لە دین کەی لاوی کورد**

**دوژمنی دین بوو–بزانە– داری هیوای تۆی بڕی**

## ﴿ (سَلَفي)يەكانى ( خَوارِج ) ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: دوای ئـەوەی زانیـت: کافرەکـان چـۆن پیلانیـان دانـا بـۆ ڕوخانـدنی (خلافـة)ی ئیـسلام، (خـوارج)ش لـە سـەردەمی ئیمـامی(علـی)و لـە سـەردەمی(خلیفـە)ی (عثماني)دا چۆن جەنگیان لەگەڵ موسوڵمانان ئـەکرد، ئـەوەش بزانـە: هـەر لـە سـەرەتای سەدەی پانزەهەمی کۆچی دا موسوڵمانان هەشیار بونەوەو چەند بزوتنەوەیەکی ئیسلامی دروست بوو و جارێکی تر هەستی (جِهاد) لە ناو دڵی موسوڵماناندا جولایەوە.

بـەڵام بـە داخـەوە: دیـسان (خـوارج) سـەریان هەڵـداوەو دەسـتیان کـردە بـە ئـاژاوە دروسـتکردن: بـۆ تێکـدانی ڕیـزی موسـوڵمانانو بـۆ مرانـدنی هەسـتی (جِهـاد) لـە دڵـی موسوڵماناندا، جـا ئـەم جارەشـیان بـە نـاوی (سَلَفِي) دێنـەوە مەیـدانی ئیـسلام، واتـە: شوێنکەوتەی (سَلَف).

بەڵام لە ڕاستی دا (سَلَفِي)یەکانی ئێستا (خـوارج)ن‌و دوژمـنترین کەسـن لەگـەڵ (سَـلَف)، چونکە هەر ئەوانەن ناوی هەرچوار پێشەوای (سَـلَف) بـە سـوکی دەهێـنن‌و دەڵـێن: ئـەو زانایانــە وەکــو (قەشــە)و (مــالم)ی جولەکــەو گاورەکــانن، هــەر ئەوانــەن دەرس بە گەنجەکانمان دەڵێن‌و پێیان دەڵێن: ئەو زانایانە بە کتێبە پـەڕ زەردەکـان پـەروەردە کراون‌و لە ئیسلام تێنەگەیشتون، هەر ئەوانەن دەڵێن: شوێنکەوتەی ئەم چوار مەزهەبانە گومڕا بونەو لە (عقیدة) تێنەگەیشتون، هەر تێنەگەیشتون. جگە لە مەش: بـە ئاشـکرایی دەڵێن: (پێغەمبەرﷺ کوڕی کافرانە). نعوذ بالله.

ئەی لاوی موسوڵمان: بەم جۆرە (سَلَفِي)یـەکانی (خـوارج) بـە نـاوی ئیـسلام لـە ئیـسلام دەدەن‌و ڕیـزی موسـوڵمانان تێـك دەدەن، جـا لـە بـەر ئـەوەی ئـەم نەزانانـە لـە هـیچ قوتابخانەیـەکی ئـایینی نەیانخوێنـدوەو لـە بەردەسـتی هـیچ زانایەیـەکی ئـایینی فێـرە خوێندنی ئایینی نەبوینـە، دەیـانبینی: وەك کـوێرێکی پێخـواس کەوتونەتـە نـاو ئـایینی ئیسلام، ئەم ئیسلامە وەکو حیزبایەتی بە خەڵکی دەناسـێنن‌و دروشمـی سـەیرو جیـاواز لە خەڵك بە کار دەهێنن، بە ئاشکرایی دیارە: بانگەوازیی ئەوان شتێکی جیاوازە لەگەڵ بانگەوازی ی ئیسلام، هەر لە شێوەی بانگەوازیەکـەیان دەردەکـەوێ کـە ئـەو بەهەشـتە پان‌و بەرینە تەنها بە مافی خۆیان دادەنێن.

ئینجا بزانە: ئەوانـەی ئێـستا ئاشـی ئـەم ئاژاوەیـە دەگێـڕن، چـەند دیلێکـی بەردەسـتی ڕۆژئاوان: وەکو (ألباني)و (ابن باز)و (صالح الفوزان)و (عثـیمین)و (محمـد جیمـل زینـو)و چەندکەسێکی تری لەم بابەتە، چەند مەڵبەندێکی تایبـەتییان هەیـە بـۆ ئـاژاوە نانـەوە: وەکو (مكتبة الغرباء) لە تورکیا، (ادارة البحـوث العلميـة والافتـاء) لـە سـعودیە، (مكتبـة الدعوة) لە (بریطانیا)و (امریکا).

ئەی لاوی موسوڵمان: جەنابت چاك دەزانی كافرەكان چەند سود لەو پەرتەوازەچیانە وەردەگرن: بۆ تێكدانی ڕیزی موسوڵمانان‌و خاوكردنەوەی بزوتنەوەكانی ئیسلامی؛ چونكە هەر ئەو تێكدەرانەن بە ناوی پاككردنەوەی(عقیدة) كەوتونەتە ناو گەنجە (مجاهد)ەكان‌و دەیانكەنە دوژمنی یەكترو (جهاد)یان لە بیر دەبەنەوە.

جا بۆ ئەم كارە ناپەسندە (دۆلار)و یارمەتییێكی زۆریان لە وڵاتە كافرەكان بۆ دێ‌و نامیلكۆكەی ڕەنگاو ڕەنگو ژەهراوی بە خۆڕایی بە سەر گەنجەكاندا بەش دەكەن‌و دەیانكەنە دوژمنی پێشەوایانی ئیسلام‌و پێیان دەڵێن: تا (عقیدة)ت پاك نەبێتەوە نابێ (جهاد) بكەی. بەم جۆرە بزوتنەوەكانی ئیسلامی بێهێز ئەكەن.

الدكتور (وهبةالزحيلي) لە زمانی (اندرسن)ی(إنگلیز) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (**ڕۆژئاواییەكان -بە تایبەتی (إنگلیز)- زۆر دەترسن بیری (جهاد)كردن لە ناو موسڵماناندا ئاشكرا ببێ؟ ئەوەكو دەنگیان بكەنە یەك دەنگ‌و ڕووبەڕووی دوژمنەكانیان ببنەوە، لە بەر ئەوە ڕۆژئاواییەكان‌و ئینگلیز هەوڵ دەدەن: بیری (جهاد)كردن نەهێڵن**). بڕوانە (آثار الحرب فی الفقه الإسلامي) ل(٥٩) و(فقه السيرة) ل(١٣٦).

ئەی لاوی موسوڵمان: تا كافرەكانی ڕۆژئاوا ئەم جۆرە تێكدەرو ئاژاوەچیەیان لە وڵاتی ئیسلامدا هەبێ‌و ڕیزی بزوتنەوەكانی ئیسلامییان پێ تێك بدەن‌و بە هۆی ململانەی بێسود گەنجەكان لە (جهاد)كردن دوور بخەنەوە، پێویست ناكا (بۆمب)و (موشەك) لە موسوڵمانان بەكار بێنن.

## ﴿ نیشانەكانی ( خوارج ) ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوا بە تەواوی بۆت ئاشكرا بوو: (سَلَفي)ی ئەم ڕۆ و (وَهابِي)ی دوێنێ‌و (خوارج)ی پێرێ، گشتیان یەكسانن، هەرسێكیان لە یەك سەرچاوەی لێڵی (بدعة)دا ئاو دەخۆنەوەو لە دەریای تاریكی (ضلالة)دا مەلەوانی دەكەن‌و ئامانجیان تێكدانی ڕیزی موسوڵمانانە، بۆیێ (سَهْل) دەفەرموێ:

(**هەر كەسێك ئیمانی خۆی ڕاست كردبێ‌و یەكخواپەرستی ی بێگەرد كردبێ، نابی بە بیدعەكار دڵی خۆش بێ‌و نابێ لەگەڵ بیدعەكار دابنیشێ، دەبی دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ بیدعەكاردا ئاشكرا بكا، هەر كەسێك نەرمی لەگەڵ بیدعەكار بنوێنێ، خوای گەورە شیرنایی سوننەتی لێ دەستێنێ، هەر كەسێك شوێن بیدعەكار بكەوێ: بۆ گەورەیی دونیا، یان بۆ ماڵی دونیا، خوای گەورە زەلیل‌و هەژاری دەكا، هەر كەسێك لەگەڵ بیدعەكار پێبكەنێ خوای گەورە نوری ئیمانی لە ناو دڵ دەردێنێ، هەركەسێك باوەڕ ناكا با تاقی ی بكاتەوە**). بڕوانە (مدارك التنزيل) ل(٢٣٧) ب(٤).

کەوابوو: ئەوا منیش چەند نیشانەیەکی (خوارج)ت بۆ دەنوسم، تاکو چاکتر بیانناسیو لێیان دوور کەویەوەو تەفرەت نەدەن‌و تەمەنی گەنجیت بە فیڕۆ نەدەن:

١-بە کافردانانی خەڵك، واتە زۆر بە ئاسانیو بە هۆی تاوانێك تۆمەتی (شرك) واتە: کافربوون دەدەنە پاڵ موسوڵمانان ﴿ كانَ ابن عمر رضي الله عنهما يَراهُمْ-أيَ الْخَوارِجَ- شرارَ خَلْقِ اللهِ، وَقالَ: إنْطَلَقُوا إلَى آياتٍ نَزَلَتْ فِي الْكُفّارِ فَجَعَلُوها عَلَى الْمُؤْمِنينَ ﴾ رواه البخاري، حەزرەتی (عبدالله)ی کوڕی ئیمامی(عمر) رضي الله عنهما (خوارج)ی بە خراپترین کەس دادەنان‌و دەیفەرموو: ئەو ئایەتانەی لە قورئان دەربارەی کافرەکان هاتونەتە خوارەوە، (خوارج) بە سەر ئیماندارانداا بەکاریان دێنن. جا هەر لە بەر ئەم سیفەتە خراپە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَليقَةِ ﴾ رواه مسلم، (خوارج) لە هەموو ئادەمیزادو ئاژەڵێك خراپترن. بڕوانە (إرشاد الساری شرح البخاری) ل(٨٤) ب(١٠).

٢-بەردەوام هەوڵ دەدەن: چینی گەنجەکان گومڕا دەکەن-بە تایبەتی ئەو گەنجانەی پلەی خوێندنیان نزمەو ئەزموونی ژیانیان نەدیتوە- جا بۆ ئەم مەبەستە چەند رێکخراوێکی بە ناو ئیسلامی بۆ چینی لاوان‌و قوتابیان دروست دەکەن‌و بە ناوی شوێنکەوتنی (سَلَف)و خۆپاراستن لە (بدعة) دەیانکەنە دوژمنی موسوڵمانان.

٣-زۆر درۆزنن‌و لە ناو موسوڵماناندا بە درۆ دروشمی (القرآن والسنة) بەرز دەکەنەوەو بە گوفتاری سەرقۆزو بن ئاڵۆز گەنجەکان وا تێدەگەێنن: کە تەنها ئەوان ڕەفتار بە قورئان‌و حەدیس دەکەن‌و خەڵکی تریش گشتی گومڕابووە، جا تکایە ئەی لاوی موسوڵمان: ئاگاداربە نەبیە گەنجێکی (خوارج)، چونکە تەمەنی لاویت-بە گومڕایی- لە دەست دەچێ. دەربارەی ئەم دوو نیشانانەی (خوارج)، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ سَيَخْرُجُ فِي آخرِ الزَّمانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الأَسْنانِ سُفَهاءُ الأحْلامِ يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لايُجاوِزُ حَناجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَما يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، فَإذا لَقيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ فَإنَّ فِي قَتْلِهِمْ أجْراً لِمَنْ قَتَلَهُمْ عِنْدَاللهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾ رواه البخاری ومسلم، واتە: لە کۆتایی زەماندا کۆمەڵێك پەیدا دەبن: تازە پێگەیشتوو و تازە لاون، کەم عەقڵ‌و کەم تێگەیشتنن، باشترین قسەی خەڵك دەکەن‌و قورئان دەخوێنن‌و لە گەردەنیان بەرەو خوار ناچێ، بە هۆی توندوتیژی لە ئایین دەردەچن هەروەك تیر لە نێچیر دەردەچێ، هەر کاتێك گەیشتنە ئەم جۆرە کەسانە بیانکوژن، چونکە کوشتنی ئەوانە پاداشتی هەیە لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەت. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٢٩) ب(٥).

ئەی لاوی موسوڵمان: جەنابت چاك دەزانی: دروشمی پیرۆزی (القران والسنة) باشترین قسەی خەڵکە، بەڵام ئەوان بە درۆ بەرزی دەکەنەوە، هەر لە بەر ئەو درۆیەش بوو، کە پێشینەکانی

(خوارج) ئەم دروشمەیان بە ناوی (لا حُكْمَ إلاّ للّه) ڕووبەڕووی ئیمامی(علی) بەرز کردەوەو ئیمامی(علی)ش له وەڵامدا فەرمووی: ﴿ كَلِمةُ حَقٍّ أُريدَ بِها باطِلٌ ﴾ رواه مسلم. واتە: ووشەی (لا حُكْم إلاّ للّه) زۆر باشەو ڕاستە-كە دادڕەوایی تەنها مافی خوایە- بەڵام مەبەست بە ووتنی ئەم وشەیە: ناڕەوایە، واتە: تێكدانی ڕیزی موسوڵمانانە.

كەوابوو: ئەگەر (خوارج)ی ئێستاش ڕاست دەكەن، با دروشمی (القرآن والسنة) ڕووبەڕووی كافرەكان بەرز بكەنەوە، نەك بەرامبەر موسوڵمانێكی ملكەچی خواو پێغەمبەر.

٤-زۆر بایەخ بە لەبەركردنی قورئانو بە نوێژو ڕۆژوو دەدەن، نوێژەكەیان بە شێوەیەكی جیاواز لە خەڵك دەكەنو خۆیان بە خواپەرست نیشان دەدەنو لە گوناهی بچوك خۆیان دەپارێزن، بەڵام گوناهی گەورە لە لایان وەك ئاوخواردنەوەیە، دەربارەی ئەم نیشانەیە پێغەمبەر دەفەرمێ: ﴿ يَخْرُجُ قَوْمٌ منْ أُمَّتي يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لَيْسَ قِراءَتُكُمْ إلى قِراءَتِهِمْ بِشَيْءٍ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ يَحْسَبُونَ أَنَّهُ لَهُمْ وَهُوَ عَلَيْهِمْ ﴾ رواه مسلم، واتە: كۆمەڵێك لە ئۆممەتی من پەیدا دەبنو لە كۆمەڵ دەردەچن: قورئان دەخوێنن، قورئان خوێندنی ئێوە بەرامبەر خوێندنی ئەوان هیچ نیە، نوێژەكەتانو ڕۆژووەكەتان بەرامبەر نوێژو ڕۆژووی ئەوان هیچ نیە، قورئان دەخوێننو وا تێدەگەن قورئان لە سودی ئەوان دەخەفتێ، بەڵام لە ڕاستیدا قورئان لە دژی ئەوانە. كەوابوو: ئەی لاوی موسوڵمان: تۆ نوێژەكەت تەنها بۆ خوا بێ، نەك بۆ حیزبایەتی.

٥-جەماعەت نەكردن: واتە: (خوارج) نوێژ بە جەماعەت لە دوای خەڵكی تر ناكەن، چونكە بە كافریان تێدەگەن، لە بەر ئەوەی خراپە قەدەغە ناكەن. بڕوانە (تحفةالمحتاج) ل(٦٧) ب(٩).

٦-زۆر بێئەدەبو بێحورمەتن بەرامبەر پێغەمبەر، دژی سەلاوات لێدانو زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرن، دژی (تَوَسُّل) واتە: هاواركردنە خوا بە خاتری پێغەمبەر...هتد، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر مامۆستا بێئەدەبەكەی پێشوویان، كە بە پێغەمبەری گوت: (إعْدِل...إتَّقِ الله)، رواه البخاری ومسلم. ئێستاش (خوارج) ووشەی (إتَّقِ الله)-وەكو دروشمێكی خۆیان- بەكار دەهێنن.

٧-زۆر بێئەدەبو بێحورمەتن بەرامبەر زانایانی (أهل السنة والجماعة)، واتە: هەر لە سەدەی یەكەمەوە تا ئێستا، گشت زانایانی ئیسلام بە بەهەڵەداچوو و گومڕابوو دادەنێنو تەنها قەسەی خۆیانو سەرانی خۆیان پێ ڕاستە، تەنانەت ئیمامی (عمر)ش لە مەسەلەی (طلاق)ی سێبەسێ بە بەهەڵەداچوو دادەنێن، باوەڕیان بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام نیەو زۆر دژی هەر چوار ئیمامەكانی سەر مەزهەبنو زانایانی ئایین بە (قەشە)و (مالم) ناو دەهێننو بە گەنجە هەڵخەڵەتاوەكان دەڵێن: وەكو گاور و

جووەكان بە قسەی (مالم)و (قەشەكان) مەكەن. جا هەر لە بەر ئەم سیفەتە پیسەیان، پێغەمبەرﷺ دەربارەی (خـوارج) دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ كلابُ أَهْلِ النّارِ ﴾ رواه الحـاكم، بە ڕاستی (خوارج) سەگی دۆزەخیانن. جا تكـات لێ دەكـەم ئـەی موسـوڵمان: بەرامبـەر زانایانی ئیسلام بێئەدەب مەبەو ڕێزی زانستیان لێ بنێ.

٨-بەردەوام ململانە لەگەڵ موسوڵمانان دەكەن، ئاژاوە دەنێنەوەو نایەڵن موسـوڵمانان سوود لە ئایین وەربگرن‌و ببنە یەك هێز بەرامبەر بە كافرەكان، ئینجا لە هەمان كاتیشدا دۆستایەتی كافرەكان دەكەن‌و یارمەتیشیان لێوەردەگرن، بەڵێ: شەهیدكردنی ئیمـامی (علی) بە دەستی (خوارج)و جەنگكردن لەگەڵ لەشكری ئیسلام لە لایـەن (وهابیـة)كـان، باشترین بەڵگەیە لە سەر ئەم ڕەفتارەیان.

جا (خوارج)ی بە ناو (سلفی)ی ئێستاش بـە هـەمان ڕەفتـار خـەریكن: (فـتح البـاری شـرح البخاری) لە بەرچاوی گەنجەكان پارچە پارچە دەكەن؟ چونكە دانەرەكەی-كە (إبـن حجـر العسقلانی)یە- لە سەر مەزهەبی (شافعی)و (اشعری)یە، ئیمامی (النـواوی) دانـەری (شـرح صـحیح مـسلم) لەكـەدار دەكـەن‌و بـە درۆزن نـاوی دەهێـنن؟ چـونكە لـە سـەر مەزهـەبی (شافعی)و (أشعری)یە، ئیتر هەر زانایەكی بەرزو بەڕێز هەیەو سودی بۆ موسوڵمانان هەیە، لەكەداری دەكەن تاكو گەنجەكان لە ڕوونـاكی زانـستی ئـەم زانـا بەڕێزانـە بێبـەش بكـەن، لە هەمان كاتیشدا ئەوان بە خۆیان دۆستی دەستەڵاتدارە (علمانیة)كانن !!!:

دەربارەی ئەم نیشانە خراپەیان پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَقْتُلُــونَ أَهْــلَ الإسْــلامِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ ﴾ رواه البخاری ومسلم، واتە: (خوارج) موسوڵمانان دەكـوژن‌و واز لە كافرەكان دەهێنن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ ﴾ رواه البخاری وسلم، (خوارج) لەو كاتەدا دەردەچن‌و دژایـەتی موسـوڵمانان دەكـەن: كـە موسـوڵمانان پەرتەوازەو بێدەسەڵاتن.

٩-بەردەوام گفتوگۆ لە (متشابهات القرآن والحـدیث) دەكـەن‌و بـە دەرس دەیـانخوێنن: وەكو (اسْتَوَى على الْعَرش)و ( يَدُ الله فَوْق ايْديهمْ)و (وَيَبْقى وَجْه ربكَ)...هتد، ڕاڤەی ئـەم جۆرە ئایەت‌و حەدیسانە بە هەواو هەوەسی خۆیان دەكەن‌و دەیانكەنە بەڵگەی خۆیان بۆ بڵاوكردنەوەی (عقیدة)ی (مجسمة)، بە ناوی شوێنكەوتنی (سَلَف)و پوختەكردنی(عقیدة)، گەنجەكان لە ڕێبازی (اهل السنة) لادەدەن:

دەربارەی ئەم نیشانەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ فِــي قُلُــوبِهِمْ زَيْــغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ...إلى آخرالأية (٧) آل عمران﴾، واتە: ئەوكەسانەی لـە

ناو دڵیاندا خواری هەیەو لە ڕاستی لایانداوە، خۆیان بە ئایەتی (متشابهات) خەریك دەكەن، تاكو خەڵكی گومڕا بكەن‌و پەرتەوازە پەیدا بكەن.
هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی (٧)ی(ال عمران)ی خوێندەوە، ئینجا فەرموی: ﴿ إذا رَأَيْتُمُ الَّذينَ يَتَّبِعُونَ ماتَشابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذينَ سَمَّى اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ ﴾ رواه البخاري ومسلم، هەركاتێك ئەو جۆرە كەسانەتان دیتن: كە بە دوای (متشابهات القرآن)دا ئەگەڕێن، بزانن: ئەوانە ئەو پیاوخراپانەن كە خودا لەم ئایەتەدا ناوی هێناون، خۆتان لەوان بپارێزن.
(إبن حجرالعسقلاني) دەفەرموێ: یەكەم جار گفت‌وگۆ كردن لە (متشابهات القران) لە ناو جووەكان ئاشكرا كرا، ئینجا لە ناو (خوارج)شدا ئاشكرا بوو، (فتح الباري) ل(٢٦٧) ب(٨).
١٠-سەرتاشین، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ سيماهُمُ التَّحالُقُ ﴾رواه مسلم، نیشانەی (خوارج) تراشكردنە. (لە باسی (وەهابی)یەكاندا ڕوونمان كردەوە)، بەڵام ئێستا ئەم نیشانەیە كەمتر بەكار دێنن، ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: لەم حەدیسەدا بەڵگە نیە كە سەرتاشین (مكروه)بێ، بەڵكو ئەوە نیشانەیەكی (خوارج)ە، نیشانەش هەیە: حەرامەو هەیە: حەڵاڵە...ئینجا دەفەرموێ: سەرتاشین لە هەموو كاتێكدا دروستە، بەڵام ئەگەر مووەكانی پێ خزمەت نەكرێ، ئەوە سوننەتە سەری بتاشێ.
(شرح مسلم بهامش القسطلاني) ل(٢٧) ب(٥).
١١-هەڵوێزنین‌و هەڵپێچانی دەلینگ‌و دامێنی جلەكانیان، حەزرەتی (أبی سعیدالخدري) لە باسی سەركردە پێشینەكەی (خوارج)دا، دەفەرموێ: ﴿...فَقام رَجُلٌ غائرُ الْعَيْنَيْنِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ ناشِزُ الْجَبْهَةِ كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقُ الرَّأْسِ مُشَمَّرُ الإِزارِ، فقالَ: يا رسُولَ اللهِ إتَّقِ اللهَ ﴾رواه البخاري ومسلم، پیاوێكی چاو قوپاوی كوڵمە زەقی نێوچاوان بەرزی ڕیش پەڕج‌و پڕی سەرتاشراوی دامێن هەڵوێزراو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە خوا بترسە!.
ئەی لاوی موسوڵمان: لێرەدا مەبەست ئەویە: (خوارج)ی ئێستاش-وەك پێشەوای ڕابردووی خۆیان- دەلینگی شەڵوارو پانتۆڵی خۆیان هەڵئەوێزنن، جا لە بەر ئەوەی ئەوان بە ناوی دروشمێكی مەزهەبی خۆیان وا دەكەن، ئەم هەڵوێزنینە بە (بدعة قبيحة) دادەندرێ، ئەگینا: دەلینگ كورتكردن سوننەتە، درێژكردنیشی تا ژێر گۆزینگ-بۆ دەعیە-حەرامە، هەروەك لە حەدیسی(بخاري‌و مسلم)دا هاتوە: (هەركەسێك-لە بەر هەواو دەعیە- دامێنی جلەكانی بە زەمیندا بخشێنی، خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت تەماشای ناكا). بەڵام ئەگەربە هەواو دەعیە نەبێ، گوناه نیە، بۆ ئەم دوو حەدیسە بڕوانە (إرشاد الساري شرح البخاري) ل(٩٠ و ٤٢٢) ب(٦) و(شرح مسلم) ل(٣٧٧) ب(٨).

ئەی لاوی موسوڵمان: منیش تکات لێدەکەم: بە فەرموودەی خواو پێغەمبەرﷺ ڕەفتار بکەو خۆت لە (خوارج) بپارێزە، ئەوەش بزانە: (خوارج) زۆر دژی ئیمامی(أشعری)و مەزهەبی(أشعری)ن، چونکە ئیمامی(اشعری) لە نەتەوەی حەزرەتی (أبوموسی الاشعری)یە: کە (صحابە)ی پێغەمبەرەوﷺ نوێنەری ئیمامی (علی) بوو: بۆ لێژنەی (التحکیم)) هەروەك باسمان کرد.

## ﴿ باسی (مُجَسّمَة) ﴾

بزانە: (مُجَسّمَة) گرۆهێکی (أهل البدعة والضلالة)ن، دەڵێن: خوا (جِسْم)=لاشەیە، ئەندامی هەنە، لە سەر (عرش) نیشتەجێیە، بڕوانە (شرح المواقف) ل(٤٩٢) ب(٢).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم باوەڕەی (مُجَسّمة)–کە دەڵێن: خوا لە سەر (عرش) جێگیرە– لە جووەکان وەرگیراوە، زانایانی (تَفسِیر) دەفەرموون: جووەکان گوتیان: (خوا لە ڕۆژی یەك شەممەوە دەستی بە دروستکردنی ئاسمانو زەمین کرد، لە ڕۆژی هەینی دا تەواوی کردن، ئینجا لە ڕۆژی شەممەدا حەساوەو لە سەر (عَرش) پاڵی داوە). ئینجا خوای گەورە لە ڕەددانەوەی جووەکان ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ ﴾(ق:٣٨)، واتە: ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی نێوانیان ئێمە دروستمان کردن لە شەش ڕۆژدا، هیچ ماندووبوونیشمان نەگەیشتێ. بڕوانە (تفسیر روح المعانی) ل(١٩٢) ب(٢٦) و(التفسیر الکبیر) ل(١٨٤) ب(٢٨).

ئیمام (إبن حجرالعسقلانی) دەفەرموێ: جووەکان باوەڕیان بە (تَجْسِیم)=لاشەیی خوا هەیەو باوەڕیان وایە: خوا لاشەیەکە ئەندامیشی هەنە، هەروەکو (مشبِّهة) توندڕەوەکانی ئەم ئوممەتەش ئەم باوەڕەیان هەیە. بڕوانە (فتح الباری البخاری) ل(٤٩٠ و٤٩١) ب(١٣).

ئەی لاوی موسوڵمان: زۆر ئاگاداربە: (خوارج)ی شەممەپەرستی ئەمڕۆ و دوێنێو پێرێ، ئەم باوەڕەی جووەکانیان هەیەو بێشەرمانە دەڵێن: (هەرکەسێك نەڵێ: خوا لە سەر (عرش) جێگیرە، کافرەو دەبی بکوژرێو لاشەی فڕێبدرێتە سەر زبڵخانەو ماڵەکەشی بە تالان بدرێتە (بَیت المال)).

منیش دەڵێم: هەی قوتابی قوتابخانەی (توراة)، ئەگەر زانایانی ئوممەتی(محمد)شﷺ بە کافر دادەنێن، تۆزێك ویژدانتان هەبێ: هەر بە لایەنیکەم بە قەد جوو و گاورەکان مافی ناشتنی گۆڕستانیان بدەنێ، جا ئەگەر لە خوای گەورەش ناترسێنو خەڵکی کافر دەکەن، پێویستە–ئێوەی فەریکە خوێندەوار– شەرم لە زانستی دانەری (شرح مسلم)و (فتح الباری)و زانایانیتری (أهل السنة) بکەن، چونکە هەرچەند سەگ بە ئاسمان بوەڕێ، هەردەمی خۆی شل دەبێ.

ئەی لاوی موسوڵمان: (خوارج)ی(مجسمة)، کە ئەم باوەڕەی جووەکان بڵاو دەکەنـەوە، دەڵێن: بەڵگەمان ئایەتی ﴿اَلرَّحْمنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾یـە، واتـەی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە دەگۆڕن‌و لە ڕاستی لایدەدەن‌و دەڵێن: (خوا لە سەر (عـرش) جـێگیر بـوو) کـەوابوو: بـۆ خزمەتی (عقیدة)ی جووەکان واتەی ئەم ئایەتە دەگـۆڕن‌و ئـەوانیش –وەکـو جووەکـانی شەممە پەرست– دەڵێن: خوا لە سەر (عرش) جێگیرە.

ئەی لاوی موسوڵمان: تاکو دڵنیا ببی: کە مەزهەبی (اهل السنة) چینی (سـلف)و (خلـف) لە سەر ئەوەیە: خوا لە هیچ شوێنێك جێگیرو نیشتەجێ نیە، ئەوا مەزهەبی (أهل السنة) دەربارەی ئەم ئایەتەت بۆ دەنووسم:

١–ئیمامی (علی)و (أم سلمة)و ئیمام (ربیعة)و ئیمام (مالـك) لـە تەفـسیری ئـەم ئایەتـەدا دەفەرموون: (اَلإسْتِواء مَعْلُومٌ وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ وَالإيمانُ بِهِ واجِبٌ وَالسُّؤالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ) أخرجه اللالكائی، واتە: زاندراوە (إستواء ) سیفەتێکی خوایە، بەڵام چۆنیەتی ئەم سیفەتە نەزاندراوەو واجبە ئیمانمان پێی هـەبێ، پرسـیارکردن لـە (إسـتواء ) بیدعەیـە. بڕوانە (فتح الباری شرح البخاری) ل(٥٠١) ب(١٣) و(الاتقان) ل(٦) ب(٢).

١–﴿عن مجاهد: إسْتَوى: عَلا عَلى الْعَرْشِ﴾ رواه البخاری، واتە: خوا بەرزبوو لە سەر (عرش). جا مەبەست لەم حەدیسەدا: بەرزی پلەو پایەیە، نەك لاشە.

کەوابوو: کە (مجسمة)کان دەڵێن: خـوا لـە سـەر (عـرش)جـێگیرە، (إبـن حجرالعسقلانی) لە شەرحی ئەم حەدیسەدا ڕەددیـان دەداتـەوەو دەفـەرموێ: (إبـن بطـال) فەرمویـەتی: گۆتەی (مجسمة)کان پوچەڵە، چونکە جێگیربوون بۆ (جسم)=لاشە بەکاردێ...ئینجـا بـە چەند لاپەڕەیـەك لـە مـەودوا دەفـەرموێ: خـوای گـەورە (جـسم)=لاشـە نیـە، کـەوابوو: پێویستی بە شوێن نیە تێیدا جێگیربێ، بێگومان خوا لە (أزل)دا هەبوو، شوێنیشی نەبو. بڕوانە (فتح الباری شرح البخاری) ل(٥٠٠ و ٥١٢) ب(١٣).

٢–پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿ كانَ اللهُ وَلَمْ يَكُنْ شيْءٌ غَيْرُهُ وَكانَ عَرْشُهُ عَلَى الْماءِ ﴾ رواه البخاري فی بدأ الخلق، وفی حدیث آخر: ﴿ ثُمَّ خَلَقَ عَرْشَهُ عَلَى الْماءِ ﴾ رواه احمد والترمذي بسند حسن، واتە: خوا لە (أزل)دا هەبوو، جگە لە خۆی شتێکی تر نەبو، ئینجا (عَرْش)ی خۆی لە سەر ئاو دروست کرد.

کەوابوو: لە (أزل)دا: نە (عرش)و نە هیچ شوێنێکی تر نەبو: خوای گەورە تێیدانیشتەجێ بێ، یان لە سەری جێگیر بێ، شتێکی ئاشکراشە: واجبە خوا بەزات‌و سیفەتەوە (أزلی)و (أبدی) بـێ، کـەوابوو: هـەروەکو لـە (أزل)دا سـیفەتی نیشتەجێ‌و جێگیربـوونی نـەبوە، لە دوای دروستکردنی بوونەوەریش سیفەتی نیشتەجێ‌و جێگیربوونی نیە، چونکە دروست

نیە سیفەتێك بۆ خوا پەیدا بکرێ کە لە (أزل)دا نەیبوبێ، هەروەکو ئیمامی (الطحاوي) لە (عقیدة)کەیدا ڕوونی کردۆتەوە.

## ﴿باسی بِدْعَة﴾

**پێناسە:** (بِدْعة) لە زمانەوانیدا: شتی تازە پەیداکراوە کە لە مەوپێش هاووێنەی نەبێ، وە لە (شەرع)دا: شتی پەیداکراو بە بێفەرمانی خواو پێغەمبەروﷺ بە بێبەڵگەیەکی شەرعی تایبەتی، یان گشتی. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ ﴾ رواه مسلم، گشت (بِدْعَة )یەك گومڕایی یە.

(بِدْعَة ) دوو بەشە: ئیمام (الشافعی) دەفەرموێ: ﴿ **وَما أُحْدِثَ وَخَالَفَ كتاباً أَوْ سُنَّةً أَوْ إِجْماعاً أَوْ أَثَراً فَهُوَ الْبِدْعَةُ الضّالَّةُ، وَما أُحْدِثَ وَلَمْ يُخالِفْ شَيْئاً مِنْ ذلِكَ فَهُوَ الْبِدْعَةُ الْمَحْمُودَةُ** ﴾ نقله النواوی وابن حجرالهیتمی، واتە: هەر شتێك لە ئاییندا پەیدا بکرێو بە پێچەوانەی قورئان، یان حەدیس، یان (إجماع)، یان ئاسەواری (سَلَف) بێ، ئەمە (بِدْعَة)یگومڕایی یە، واتە: (قَبِیحَة). وە هەر شتێك پەیدا بکرێو بە پێچەوانەی ئەم چوار بەڵگەی ڕابردوو نەبێ، ئەمە (بِدْعَة )یباشە، واتە: (حَسَنَة). بڕوانە (تهذیب الاسماء واللغات) ل(٢٢) ب(٣) و(فتح المبین شرح الاربعین) ل(٩٥ و ١٩٧).

بەڵگە لە سەر فەرموودەی ئیمامی (الشافعی): پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك کردەوەیەکی ئایینی بکا: کە فەرمانی ئێمەی لە سەر نەبێ، ئەوە لێ ی قبوڵ ناکرێو ڕەد دەکرێتەوە سەری .

واتە: ڕستەی(كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ) واتەیەکی گشتی دەدا، بەڵام بە ڕستەی(لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنا)ی ئەم حەدیسە، ڕاڤەی دەکەینو واتەیەکی تایبەتی ی لێ هەڵدێنجین و دەڵێین: گشت (بدعة)یەك گومڕایییە، تەنها ئەو (بدعة)یە نەبێ: کە فەرمانێکی شەرعی ی لە سەر بێ.

**بۆ وێنە:** چاپکردنی قورئان (بِدْعَة)یەکە تازە پەیدا کراوە، بەڵام دەچێتە ژێر فەرمانی پێغەمبەرﷺ: ﴿ بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً ﴾رواه البخاری، لە جیاتی من بگەیێننە ئۆممەتم، هەر چەند یەك ئایەتیش بێ. کەوابوو: (بدعة حسنة)یە. هەروەها: ڕەنگکردنی مزگەوت (بدعة)یەو ناچێتە ژێر یەکێك لەم چوار بەڵگەیەی ئیمامی (الشافعی) باسی کردن، کەوابوو: (بدعة قبیحة)یە.

ئینجا بزانە: بەم ڕونکردنەوەیە مەبەستی ئیمامی (النواوی) دەردەکەوێ کە لە شەرحی حەدیسی ﴿كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾دا، دەفەرموێ: ئەم واتە گشتییە تایبەت کراوەو مەبەست زۆربەی (بدعة)کانە...ئینجا دەفەرموێ: ئەم تایبەتکردنە وەکو فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ﴾(الاحقاف: ٢٥)، واتە: ڕەشە بایەکە زۆربەی شتی لە ناو دەبەرد. بڕوانە (شرح مسلم بهامش القسطلاني) ل(١٦٢) ب(٤).

ئـەی لاوی موسـوڵمان: لـەم فـەرموودەی ئیمـامی(الـشافعی) بـۆت ئاشـکرا بـوو: کـە بەشکردنی (بدعة) بۆ (حسنة)و (قبیحة)، فەرموودەی ئیمامێکی (سلف)ی عەرەب زمانی نەژاد (قرێشی)یە، کە زۆر باش لە ووشە پیرۆزەکانی پێغەمبەرﷺ تێدەگا –کە دەفەرموێ: ﴿کُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾– چونکە زمانی خزمی خۆیەتی، جا ئەگەر فەریکە خوێندەوارێکی پێنەگەیشتوو گوتی: (شافعی) تێنەگەیشتوە. تۆش لە وەڵامی دا بڵێ: (بـڕۆ بـەو لاوە، کەینێ بۆقە ڕەشکەی چڵکاوی (ضلالة)، دەتوانێ بەرامبەر نەهەنگی دەریای زانستی (نبوة)ﷺ ڕابوەستێ؟!!!).

## ﴿ بڕیارەکانی شەرع دەربارەی ( بِدْعَة ) ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: لە سەر فـەرموودەی ئیمـام (إبـن عبدالسلام)و ئیمـام (النـواوی)و ئیمام (إبن حجر العسقلانی)و ئیمام (ابن حجر الهیتمی)-رحمهم الله تعالی- دەربـارەی بڕیارەکـانی شەریعەتی ئیسلام، (بدعة ) دەکرێتە پێنج بەش:

**یەکەم:** (البدعة الواجبة)، واتە: بیدعەی واجب، وەکو فێربوونی (نحو)و (صرف)و (لغة)و ...هتد، بۆ تێگەیشتنی قورئانو حەدیس.

**دووەم:** (البدعـة المُحَرَّمَـة)، واتـە: بیدعـەی حـەڕام، وەکـو بڵاوکردنـەوی مەزهەبـەکانی (أهل البدعة): وەك (مجسمة)و (خوارج)و...هتد.

**سێیەم:** (البدعة المَنْدُوبة)، واتە: بیدعەی سوننەت، وەکو دروستکردنی قوتابخانەو شوێنی حەوانەوەی موسوڵمانانی خواپەرستو (مجاهد)ەکان لە سەر سنووری ئیسلامو کوفر.

**چوارەم:** (البدعة المکروهة)، واتـە: بیدعـەی ناپەسـند، وەکـو ڕەنگکـردنو ڕازاندنـەوەی مزگەوتەکان.

**پێنجەم:** (البدعة المباحة)، واتە بیدعەی حەڵاڵ، وەکو تێر خواردنو خواردنی خۆشو جلو بەرگی بە نرخو جوان. بڕوانە (قواعد الاحکام) ل(١٧٣) ب(٢) و(شرح مسلم) ل(١٦٢) ب(٤) و(فـتح البـاری شـرح البخـاری) ل(٢٥٣) ب(٤) و(فـتح المـبین شـرح الاربعـین) ل(١٩٧)، وە هەروەها بڕوانە (البدعة) دانراوی الدکتور (عبدالملك السعدی) ل(١١) تا (١٥).

ئـەی لاوی موسـوڵمان: هـا: ئـەو زانایانـە ئەسـتێری پڕشـنگداری ئاسمـانی (أهـل السُّنة والجماعة)ن، دەبا خەڵوزە ڕەشەکانی (البدعة والضلالة) لە ناو ئاگردانی نەزانی دا، بـەرە بەرە بسوتێنو ببنەوە خۆڵەمێش.

## ﴿ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئیمام (إبن بطال)و قازی (عیاض)و چەند زانایەکی تر دەفـەرموون: خۆشویستن سێ بەشە:

**یەکەم**: خۆشویستنی گەورەیی و ڕێز لێنان: وەکو خۆشویستنی دایك و باوك.
**دووەم**: خۆشویستنی بەزەیی پێداهاتن: وەکو خۆشویستنی منداڵ.
**سێیەم**: خۆشویستنی چاکە لەگەڵکردن و هاوڕێیەیی: وەکو خۆشویستنی خەڵکی تر...
جا لە بەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ ڕێنموونی کردوین بۆ چاکەو ڕزگاری کردوین لە ئاگری دۆزەخ، واجبە: خۆشویستنی ئەو-بە هەر سێك بەشەوە- زیاتر لە هەموو کەسێك لە ناو دڵماندا کۆ بکەینەوەو یارمەتی ڕێبازەکەی بدەین و بەرگری لە شەریعەتەکەی بکەین، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْه منْ وَلَده وَوَالده وَالنَّاس أَجْمَعِينَ ﴾رواه البخاری ومسلم، یەکێکتان ئیمانی تەواو نابێ، تا منی لە منداڵی و دایکی و باوکی و گشت خەڵکی تر خۆشتر ئەوێ.
کەوابوو: مافی پێغەمبەرﷺ لەپێشترە لە مافی ئەم سێ چینەو واجبە: گیان و ماڵ و خزم و کەسمان لە ڕێبازی پێغەمبەرداﷺ بەخت بکەین و ڕێزی لە ڕێزی باوکمان و گشت کەسێکی تر زیاتر بێ، چونکە ئەم گەورەو بەڕێزە چاکەی لەگەڵ ئێمە کردوە، جا هەر کەسێك ئەم باوەڕەی نەبێ، ئیمانی تەواو نیە. بڕوانە (شرح مسلم بهامش القسطلاني) ل(۳۲۹) ب(۱).
بەڵێ: هەر کەسێك پێغەمبەریﷺ لە گیانی خۆی خۆشتر نەوێ، ئیمانی تەواو نیە، چونکە ئیمامی(عمرﷺ) بە پێغەمبەریﷺ گوت: ﴿ يَارَسُولَ الله، لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ منْ كُلِّ شَيْء إلاَّ منْ نَفْسي، فَقَال النَّبيُّﷺ: لاَ، وَالَّذى نَفْسي بيَده حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ منْ نَفْسكَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: فَإِنَّهُ اْلآنَ وَالله لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ منْ نَفْسي، فَقَال النَّبيُّﷺ: اَلآن يا عُمَرُ ﴾ رواه البخاري، ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ لە هەموو شتێك لە لام خۆشەویستتری تەنها لە گیانی خۆم نەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئیمانت تەواو نابێ، تا لە گیانی خۆشت خۆشترت دەوێم، ئینجا ئیمامی(عمر) فەرمووی: ئێستا-والله- لەگیانی خۆشم خۆشترم دەوێی، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (عمر) ئێستا زانیت ئیمانت تەواو بکەی.
بەڵێ: دەبی باوەڕمان وابێ: کە پێغەمبەرﷺ لە گشت ئادەمیزادێك و فریشتەیەك ڕێزی زیاترە، بەڵام نابێ بەرزی بکەینەوە بۆ پلەی خوایەتی، هەروەك بەخۆی دەفەرموێ: ﴿لا تُطْرُوني كَما أَطْرَت النَّصارَى ابْنَ مَرْيَم، فَإِنَّما أَنَا عَبْدٌ، فَقُولُوا: عَبْدَالله وَرَسُولُهُ﴾ رواه البخاری، واتە: لە سنووری خۆم گەورەترم مەکەن وەکو گاوروەکان (حەزرەتی عیسی ابن مریم)یان-علیه السلام- لە سنوری خۆی گەورەتر کردو گوتیان: کوڕی خوایە، من بەندەی خوام، کەوابوو: پێم بڵێن: بەندەی خواو پێغەمبەری خوا.
ئەی لاوی موسوڵمان: لەم حەدیسانەدا بۆت ئاشکرا بوو: خۆشویستن و ڕێزلێنانی پێغەمبەرﷺ شتێکی واجبەو تەواوکەری ئیمانە، بەڵام بەرزکردنەوەی بۆ پلەی خوایەتی،

شتێكیترەو حەڕامەو پێ ی كافر دەبی، بۆیێ (البوصیری) لە (قصیدة البردة)دا، ئاماژە بۆ ئەم حەدیسانەی ڕابردوو دەكاو دەفەرموێ:

(دَعْ ما ادَّعَـتْهُ النَّصارَی فِی نَبِیِّهِمِ وَاحْكُمْ بِما شِئْتَ مَدْحاً فِیهِ وَاحْتَكِمِ)
(فَانْسُبْ إلی ذاتِه ما شِئْتَ مِنْ شَرَفٍ وَانْسُبْ إلی قَدْرِه ما شِئْتَ مِنْ عِظَمِ)
(فَإنَّ فَضْلَ رَسُولِ اللّهِ لَیْسَ لَهُ حَدٌّ، فَیُعْرِبَ عَنْهُ ناطِقٌ بِفَمِ)

## ﴿ گۆڕی پێغەمبەرﷺ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئاگاداری: كاتی خۆی كافرەكان چۆن دوژمنایەتی پێغەمبەریانﷺ دەكردو چەند پیلانێكیان دامەزراند بۆ لەناوبردنی پێغەمبەرﷺ بەڵام خوای گەورە پێغەمبەریﷺ پاراستو ئایینەكەی خۆی سەرخست، جا لەو ڕۆژەوە تا ئێستا كافرەكان بەردەوامن: لە دژایەتی ئیسلامو لە دوژمنایەتی پێغەمبەرﷺ، واتە: لە دوای وەفاتیشی هەر هەوڵ دەدەن: موسوڵمانان لە خۆشویستنو شوێنكەوتنی پێغەمبەرﷺ دوور بخەنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش گشت تواناو ڕێگەیەك بەكار دێنن: تاكو موسوڵمانان لە سەلاوات لێدانو ڕێزلێنانو زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ دوور بخەنەوە.

ئەی لاوی موسوڵمان: فەرموو ببینە: بەرپرسێكی (وزارة الخارجیة)ی(فرنسا) دەڵی: (وَما قَبْرُ مُحَمَّدٍﷺ إلاّ عَمُودٌ كَهْرَبائِیٌّ یَبْعَثُ الْجُنُونَ فِی رُؤُوسِ الْمُسْلِمِین)...ئینجا دەڵێ: (أعْتَقِدُ أنَّ مِنَ الْواجِبِ: تَدمِیْرَ الْكَعْبَةِ وَوَضْعَ قَبْرِ مُحَمَّدٍ وَجُثَتِه فِی مَتْحَفِ اللّوفَر)، واتە گۆڕی (محمدﷺ) كۆڵەگەیەكی كارەبایی یە، شێتایەتی زیندوو دەكاتەوە لە سەری موسوڵماندا...باوەڕم وایە: پێویستە (كعبة)ی ماڵی خوا بڕوخێنینو گۆڕی (محمد)و لاشەكەی لە مۆزەخانەی (لۆڤەر) دابنێین. بڕوانە كتێبی (دمِّروا الإسلام) ل(٤٤).

ئەی لاوی موسوڵمان: بەرپرسی (فرنسی) بە شێت دامەنێ كە ئەو ئێمە بە شێت دادەنێ، چونكە شێتایەتی ئێمەی موسوڵمان بە هۆی ئەو خۆشیەیە: كە لە كاتی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ دەبینینو هەست دەكەین: لە باغی بەهەشتو لە سەر حەوزی(الْكَوْثَر) وا لە خزمەت پێغەمبەرینﷺ، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ مابَیْنَ بَیْتِی وَمِنْبَرِی رَوْضَةٌ مِنْ رِیاضِ الْجَنَّة، وَمِنْبَرِی عَلَی حَوْضِی ﴾رواەالبخاری ومسلم، نێوان ماڵی من-ئەو ژوورەی گۆڕی پێغەمبەریﷺ تێدایە-و نێوان مینبەری ووتارخوێندنەوەم باغێكە لە باغەكانی بەهەشت، مینبەری ئێستای من وا لە سەر حەوزی(الْكَوْثَر)ی منە.

## ﴿(صلاح الدین الأیوبي)و پیلانێكی پوچەڵكراو﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: جەنابت باش دەزانی: كافرەكان بێبەشن لە تامو بۆنی ئەم باغە پڕ گوڵو میوە ئیمانیەیە، هەر هەوڵیش دەدەن: چەند موسوڵمانێكی ساویلكە

هەڵخەڵەتێنن: تاكو دەهۆڵیان بۆ لێ بدەن‌و بڵێن: (زیارەتی گۆڕی‌پێغەمبەرﷺ حەرامـە).
بە خۆیشیان بێبەش بکەن لە تام‌و بۆنی ئەم گوڵزارەی بەهەشت، جا لە ڕاستـی دا ئـەم هەوڵە هەر هەوڵی ئەمڕۆ نیە، بەڵکو دەگەڕێتـەوە سـەردەمی پاڵـەوانی ئیـسلام: (صـلاح الـدین الأیـوبي) کـوردی، هۆیەکەشـی ڕق‌و قینـەی کافرەکانـە–بـە تایبـەتی کافرەکـانی (فرنسی)– بەرامبەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ، چونکە چـەند مێـژوو نوسـێکی ئیـسلام: وەکـو (إبن الاثیر)و (إبن جبیر)و (المقریزی) دەگێڕنەوە:
(سەرکردەیەکی (صلیبي) لە قەڵای (الکرك) بـوو، نـاوی (رینـو–ریجنالـد)ی (فرنـسي) بـوو، پێیـان دەگـوت: (ألـبرنس– ارنـاط)، لـە سـاڵی (٥٧٨)ی کۆچـی، چـەند پـاپۆڕێکی دەریایی دروست کردو پڕی کردن لـە سـەرباز، ئینجا خـۆی‌و سـەربازەکانی هێرشـیان بـردە سـەر (مکـة)و (مدینـة)، تـاکو (کعبـة)ی پـیرۆز بـڕوخێنن‌و لاشـە پیرۆزەکـەی پێغەمبـەرﷺ لـە گـۆڕی پـیرۆزی دەربێـنن‌و بینێرنــە (فرنـسا)، ڕێگـەش نەدەنـە موسوڵمانان: زیارەتی بکەن، تەنها بە پارە نەبێ).
ئینجا کە هەواڵی ئەم هێرشە گەیشتە (صلاح الدین)، یەکسەر فەرمانی دا: هێزی دەریایی ئیسلام لە (مصر) بە سـەرکردایەتی (حسام الـدین لؤلـؤ) بـە زوتـرین کـات ئـەم هێرشـە پوچەڵ بکاتەوە، ئیتر هێزی دەریایی ئیـسلام–بـە دەریـای سـۆردا– بـەرەو کافرەکـانی (صَلیبي) ڕۆیشت‌و لە کاتێکدا تەنها ماوەی یـەك ڕۆژ مـابوو کافرەکـانی(صَـلیبي) بگەنـە (مدینة)ی پیرۆز، جەنگاوەرانی ئیسلام بۆیان دابەزینە خاکی (حِجاز)و لەگەڵیان ڕووبەڕوو بونەوەو ڕاستەو چەپ، بگرەو بکوژە، بـە مـاوەی پێـنج ڕۆژ قڕانیـان بـۆ هێنـان‌و سـەدو حەفتا کافریان لێ بە دیل گرتن‌و بە سەر چەند شارێکدا بەش کران: تـاکو لـە بـەر چـاوی خەڵك بکوژرێن‌و کافرەکانی تریش پێوە تەمبێ ببن، بەڵام (ریجنالد)ی کافر توانی خـۆی دەرباز بکاو بگاتەوە قەڵای (الکرك) لە (أُرْدن)، ئینجا (صلاح الدین) نـەزری کـرد: ئەگـەر بیگرێ، بە دەستی خۆی بیکوژێ.
بەڵام ئەم کافرە قین لەدڵە بـەم شُکستەش تـەمبێ نـەبو، بـەڵکو لـە سـاڵەکانی (٥٨٢ و ٥٨٣)ی کۆچی دا، دەستی کرد بـە ڕێگـەگرتن: لـە کاروانـچی‌و حاجیـەکانی موسـوڵمان: دەیگرتن‌و ئازاری دەدان‌و گاڵتـەو سـوکایەتی ی پـێ‌دەکردن‌و دەیگـوت: (بـە (محمـد)ی پێغەمبەرتان بڵێن: لە هاوارتان بێ‌و یارمـەتیتان بـدا). ئینجـا کـە (صـلاح الـدین) ئـەم خەبەرەشـی پێ‌گەیـشت، دوویـارە نـەزری کـرد: ئەگـەر (ریجنالـد)ی (فەرەنسی) بگـرێ، بە دەستی خۆی بیکوژێ.

ئیتر (صلاح الدین الایوبی) سەدو پەنجا هەزار جەنگاوەری موسوڵمانی- لە کوردو تروکمان- کۆ کردەوەو لە (٢٤) ربیع الثاني (٥٨٣)ك، بەرامبەر (٣)ی تموز (١١٨٧)ز. هێرشی کردە سەر کافرەکانی(صَلیبي) لە (حطین)، جا لە دوای جەنگێکی توندوتیژ، خوای گەورە سەرکەوتنی بۆ ئیسلام ناردو پاشای (قُدْس) لەگەڵ (ریجنالد)ی کافر، هەردووکیان بە دیل گیران، ئینجا (صلاح الدین) داوای لە (ریجنالد) کرد: شادە بێنێو ببێتە موسوڵمان. بەڵام ئەم کافرە نەبوە موسوڵمان، ئینجا (صلاح الدین) خەنجەرێکی لە نێوان شانەکانی داو نەزرەکەی خۆی هێنا دیو فەرمووی: (ها أَنَا ذا، أَنْتَصِرُ لِمُحَمَّدٍﷺ)، **ها ئەوە منم تۆڵەی (محمد)ی پێغەمبەرﷺ دەستێنم.** ئینجا پاسەوانەکان لە ناو خێمە فڕێیان دایە دەرەوەو بە تەواوی کوشتیان.

ئەم باسە کۆ کراوەتەوە لەم سەرچاوانە: (الکامل فی التأریخ) ل(١٥٩و١٧٤و١٧٧) ب(٩) و(رحلة ابن جبیر) ل(٣٥) و(خطط المقریزي) ل(٨٦) ب(٢) و(شعلةالإسلام) ل(٩٤ تا ٩٦).

ئەی لاوی موسوڵمان: وا مەزانە: جەنگی ئیسلامو (صَلیبي)یە کافرەکان کۆتایی هاتوە، چونکە ئەوان بۆ لێدانی ئیسلام هەر لە پیلان نانەوەدانەو ڕقو قینەیان بەرامبەر بە ئیسلام هەر زیاتر دەبێ، ئەوە بوو: جەنگی یەکەمی جیهانیان هەڵگیرساندو لە ساڵی (١٩١٤)ز، سەرکردەیەکیتری (صَلیبي): کە ناوی (غورو)ی(فرنسی) بوو، شاری (دمشق)ی داگیر کردو چووە پێش گۆڕی (صلاح الدین الایوبی)و گوتی: (**ها قَدْ عُدْنا یا صلاح الدین**) ئاگاداربە: ئەی (صلاح الدین) وا جارێکی تریش هاتینەوە. بڕوانە (الإمام أمجدالزهاوی) ل(٤٨).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم (صلاح الدین الایوبي)یە، کوردێکی موسوڵمانەو باپیری منو تۆیە، بە وردی بیر بکەوە: چونکە (صلاح الدین) ئەوها دڵسۆزی ئیسلام بوو، کافرەکانی(صَلیبي) چیان بە سەر گەلی کوردی موسوڵمان هێنا، چۆن کوردستانیان پارچە پارچە کرد.

لە لایەکی تریش بیر بکەوە: (خوارج) هیچ بایەخ بە (صلاح الدین) نادەنو لە زیندانی مێژوودا دەیخنکێنن؟ چونکە (صلاح الدین)ی کافرکوژ، گۆڕی پێغەمبەریﷺ لە پیلانی (صَلیبي)یەکان ڕزگار کردوە، بەڵام (محمد بن عبدالوهاب)ی موسوڵمانکوژ، بە (شیخ الاسلام)و (رئیس الموَحِّدین) ناو دەهێنن، چونکە دژی گۆڕی پێغەمبەرﷺ بوو.

هەر بە هۆی پەیوەندی پتەوی نێوان (وهابی)یەکانی(خوارج)و (صَلیبي)یەکانی کافر لە ساڵی(١٩٩٠)ز، جارێکی تریش (صَلیبي)یەکان هاتنەوە سەر خاکی ئیسلام-هەروەك باسمان کرد- ئیتر لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە: (خوایە ڕەحم بە موسوڵمانان بکەو (صلاح الدین)ێکمان بۆ پەیدا بکە).

خودایە پاداشتی چاکەی قازی (محی الدین: الخطیب الدمشقي) بدەوە، کە لە کاتی خۆیدا، لە مەدحی (صلاح الدین الایوبی)دا فەرمووی:

| | |
|---|---|
| اَلْحَمْدُ لِلَّهِ ذَلَّتْ دَوْلَةُ الصُّلُبِ | وَعَزَّ بِالْكُرْدِ دِينُ مُصْطَفَى الْعَرَبِ |
| بَيَّضْتَ بِالْكَرْدِ وَجْهَ الْكُرْدِ فَأْتَلَقُوا | كَوَاكِبَ فِي سَمَاءِ الْمَجْدِ وَالْحَسَبِ |
| رَدُّوا الْحَيَاةَ إِلَى الْإِسْلَامِ وَابْتَهَجُوا | بِالدِّينِ مُحْتَسِباً بِإِثْرِ مُحْتَسِبِ |
| أَعْيَا جِهَادُكَ قَوْماً أَبْطَنُوا حَسَداً | وَأَظْهَرُوا عَجَباً أَدَّى إِلَى الْعَجَبِ |
| أَيَنْصُرُ الدِّينَ كُرْدِيٌّ! فَقُلْ لَهُمُ | اَلدِّينُ لِلَّهِ، لاَ لِلْكُرْدِ وَالْعَرَبِ |

## ﴿ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺو موسوڵمانانی تر﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئێستا دەزانی: کافرەکان بەرامبەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ چەند قین لەدڵن، جا ئەوەی جێگەی داخە: کە دەبینین: چەند قوتابیەکی (ریجنالد)ی(فرنسی) بە دەهۆڵی کوفر لێ دەدەن‌و دەڵێن: زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ (بدعة)یەو حەرامە، بەڵکو لەمەش زیاتر دەڵێن: هەر مزگەوتێك گۆڕی تێدا بێ، نوێژکردنی تێدا دروست نیەو دەبێتە (شرك)، کەوابوو: نوێژکردن لە مزگەوتی پێغەمبەریشداﷺ دروست نیە، چونکە ئێستا گۆڕی پێغەمبەروﷺ ئیمامی(أبوبكر)و ئیمامی(عمر) لە ناو مزگەوتی پێغەمبەردانەﷺ لە (مدينة)ی پیرۆز، بەڵام ئەم گۆتەیە بە پێچەوانەی (اجماع)ی زانایانی ئیسلامەو تەنها لە دەمی قین لەدڵانی قوتابخانەی (ریجنالد) دەردەچێ.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَدْ كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ الْقُبُورِ، فَقَدْ أُذِنَ لِمُحَمَّدٍ فِي زِيارَةِ قَبْرِ أُمِّهِ، فَزُورُوها فَإِنَّها تُذَكِّرُ الآخِرَةَ ﴾ رواه مسلم والترمذي واللفظ له، واتە: لەمەو پێش زیارەتی گۆڕەکانم لە ئێوە قەدەغە کردبو، ئەوا (محمدﷺ) ئیزن درا: زیارەتی گۆڕی دایکی خۆی بکا، کەوابوو: ئێوەش زیارەتی گۆڕەکان بکەن، چونکە قیامەتتان بە بیر دێنێتەوە. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٣١٥) ب(٤).

ئەی لاوی موسوڵمان: ووشەی (فَزُورُوها) فەرمان=(أمر)ی پێغەمبەرەﷺ، جا ئەگەر ئەم فەرمانە (واجب)ش نەبێ، گومان نیە: کە (سنة)ە، کەوابوو: زیارەتی گۆڕی گشت موسوڵمانێك سوننەتە، بەڵام زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ خێرترە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ زارَ قَبْرِي وَجَبَتْ لَهُ شَفاعَتِي ﴾ رواه ابن خزيمة والدارقطني والبيهقي، قال النواوي: ضعيف، وقال السبكي: حسن، وقال ابن حجرالهيتمي: صحيح، واتە: هەرکەسێك زیارەتی گۆڕەکەم بکا، شەفاعەتی منی بۆ واجب دەبێ. تکایە بگەڕێوە باسی (اجماع‌و حەدیسی پێغەمبەرﷺ)، هەروەها بڕوانە (مفاهيم يجب ان تصحح) ل(٢٧٠)

ئەی لاوی موسوڵمان: هەرچەند ئیمامی (النواوی) ئەم حەدیسەی بە (ضعيف)=بێ‌هێز داناوە، بەڵام ئەویش فەرموویەتی: دروستەو سوننەتە: حەدیسی بێ‌هێز بۆ کاروباری چاکە بەکار بێ، هەروەها ئەویش فەرموویەتی: زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ لە گرنگترین

خواپەرستیـیەو لە بە قازانجترین هەوڵدانە. بڕوانە (الاذكار) ل(٥و ١٧٤) (المجموع بشرح المهذب) ل(٢١٤)ب(٨).

ئینجا بزانە: کـە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿ لا تَشُدُّوا الرِّحالَ إلاَّ إلى ثَلاثَـةِ مَـساجِدَ: مَسْجِدِيهذا وَالْمَسْجِدالْحَرَامِ وَالْمَسْجِدالأَقْـصَى ﴾ رواه البخـاري ومـسلم، بارگـەتان مەپێچن بۆ نوێژکردن، تەنها بۆ سێ مزگـەوت نـەبێ: مزگـەتی مـن لـە (مدینـە)، مزگـەوتی (الحـرام) لـە (مکـة)، مزگـەوتی(الاقـصی) لـە (فلـسطين). لـەم حەدیـسەدا مەبەسـت قەدەغەکردنی سەفەرکردنە بۆ نوێژکردن، هەروەك لـە (مـسند)ی ئیمـام (احمـد)دا هـاتوە، نەك سەفەرکردن بۆ زیارەتی گۆڕ، بڕوانە (ارشاد الساری شرح البخاری) ل(٢٤٤) ب(٢).

## ﴿ چۆنیەتی زیارەت ﴾

ئەوی لاوی موسوڵمان: یەکەم جار کـە لـە مزگـەوتی پێغەمبـەرﷺ چـویتە ژوورەوە، بـڕۆ نێوان مینبەرو گۆڕی پـیرۆزی –کـە پـێی دەگـوترێ: (الرَّوْضَـةُ الْمُطَهَّـرة)– دوو ڕەکعـەت (تحیة المسجد) بکە، ئینجا بەرەو گۆڕی پیرۆز بڕۆ و پشتت لە (قیبلـە)و ڕووت لـە گـۆڕی پیرۆزی بکەو بڵێ: (السَّلامُ عَلَيْـكَ يـا رَسُـولَ اللهِ). چـونکە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿ ما مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ ﴾ رواه أبـوداود بسند صالح، واتە: هەر کەسێك سـەلامم لێ بکـا، خـوای گـەورە گوفتـارم دەداتـەوە تـا وەڵامی سەلامی دەدەمەوە.

بەڵام زۆر ئاگاداربە: بە دەورەی گۆڕدا مەسوڕێوەو دەستو زگو پشتت بە دیواری گۆڕدا مەهێنەو ماچی مەکەو پشتاوپشت مەگەڕێوە، ئینجا بە قەد گـەزێك بـەرەو ڕاسـتە بـڕۆ و سەلام لە ئیمامی(أبوبکرﷺ) بکە، ئینجا بە قەد گەزێکی تـر بـەرەو ڕاستە بـڕۆ و سـەلام لە ئیمامی(عمرﷺ) بکە، چونکە هەردووکیان بەم ڕیزە لە پشتەوەی پێغەمبەرﷺ لـە نـاو ژوورەکەی حەزرەتی(عائشە)دا نێژراون، ئینجا ڕوو لە (قیبلە) دەست بە دوعا بکە. بڕوانە (حاشیة الشروانی) ل(١٤٤) ب(٤).

ئینجا بزانە: ئەم سەلامکردنە لە کاتی زیارەتی گۆڕی گشت موسوڵمانێك سوننەتە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەچووە زیارەتی گۆڕستانو دەیفەرموو: ﴿ اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ دارَ قَوْمٍ مُـؤْمِنِينَ وإنَّا إنْ شاءَاللهُ بِكُمْ لاحِقُـونَ ﴾رواه أحمد ومسلم، هـەروەها دوعاشـی بـۆ دەکـردنو دەیفەرموو: ﴿ يَغْفِرُ اللهُ لَنا وَلَكُمْ ﴾رواه الترمذي، خوا لە ئێمەو لە ئێوە خۆش ببێ.

ئینجا بزانە: هیچ کاتێکی تایبـەت بـۆ زیـارەتی گـۆڕی پێغەمبـەرﷺ دانەنـدراوە، چـونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ لا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيداً ﴾ رواه أبوداود بـسند حـسن، گـۆڕی من مەکەنە جەژن، واتە: وەکو جەژن لە مانگو ڕۆژێکی تایبەتدا زیارەتی گۆڕم مەکەن.

بەلاَم ئیمام (إبن حجرالهیتمی) دەربارەی حاجیان دەفەرموێ: سوننەتە لە پێش حەج کردن، یان لە دوای حەج کردن، زیارەتەکە بکەن. بڕوانە (تحفةالمحتاج) ل(١٤٤)ب(٤).

## ﴿ دڵ خۆشبوونێك ﴾

(إبن کثیر) لە ( أبومنصور) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (عتْبی) فەرموویەتی: جارێك لە خزمەت گۆڕی پێغەمبەرﷺ دانیشتبوم، عەرەبێك هاتو گوتی: (السَّلامُ عَلَيْكَ يا رسولَ الله)، بیستومە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّاباً رَحِيماً ﴾، واتە: ئەگەر ئەوانە ستەمیان لە خۆ کرد: بە تاوان کردن جا هاتنە لای تۆ (ئەی پێغەمبەرﷺ)، ئینجا لە خوا پاڕانەوە تاکو لە گوناهیان خۆش ببێو پێغەمبەریشﷺ بۆیان پاڕاوە، دەبینن خوای گەور تۆبەیان قبولْ دەکاو ڕەحمیان پێدەکا. ئینجا عەرەبەکە گوتی: وا هاتمە لای تۆ (ئەی پێغەمبەرﷺ) لە خوا دەپاڕێمەوە لە گوناهم خۆش ببێ، تۆش دەکەمە تکاکار لە لای خوای گەورە. ئینجا عەرەبەکە ئەم شیعرانەی گوتن:

| | |
|---|---|
| يا خَيْرَ مَنْ دُفِنَتْ بِالْقاعِ أَعْظُمُهُ | فَطَابَ مِنْ طيبِهِنَّ الْقاعُ وَالأَكَمُ |
| نَفْسِي الْفِداءُ لِقَبْرٍ أَنْتَ ساكِنُهُ | فِيهِ الْعَفافُ وَفِيهِ الْجُودُ وَالْكَرَمُ |
| أَنْتَ النَّبِيُّ الَّذي تُرْجَى شَفَاعَتُهُ | عِنْدَ الصِّراطِ إِذا مازَلَّتِ الْقَدَمُ |
| وَصاحِباكَ فَلا أَنْساهُما أَبَداً | مِنِّي السَّلامُ عَلَيْكُمْ ما جَرَى الْقَلَمُ |

(عتبی) دەفەرموێ: ئینجا عەرەبەکە ڕۆیشت، منیش خەوتمو پێغەمبەرمﷺ لە خەونمدا بینیو فەرمووی: (ئەی (عتبی) موژدە بدە عەرەبەکە خوای گەورە لێ ی خۆش بوو).
تکایە: بڕوانە (باسی ژیانی پێغەمبەرانﷺ لە ناو گۆڕدا) لەم پەڕتوکەدا، هەروەها بڕوانە (تفسیر ابن کثیر) ل(٥٢٠) ب(١) و(روضة المحتاجین) ل(٣٧٥).

## ﴿ خێری ( فاتحَة ) بۆ مردوو ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: کە تەماشای گۆڕستانەکانی کوردستان دەکەی، دەبینی: پڕە لە داربەڕوو و دارمازو و درەختیتر، هەروەها دەبینی: موسوڵمانان خێری (فاتحة) بۆ مردوو دەنێرن، جا بۆ ئەوەی بزانی: درەختی گۆڕستانو خوێندنی (فاتحة) لە چی وەرگیراوە، فەرموو: با بە یەکەوە بچینە خزمەتی ئەم فەرموودانە:
﴿ عن ابن عباس رضیالله عنهما: مَرَّ رَسُولُ اللهِﷺ عَلى قَبْرَيْن، فقال: إِنَّهُما لَيُعَذَّبان وَما يُعَذَّبان في كَبيرٍ، بَلَى: أَمّا أَحَدُهُما فَكانَ يَمْشي بالنَّميمَة، وَأَمّا الآخَرُ فَكانَ لا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِه، فَدَعا بِعَسيبٍ رَطْبٍ فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ، ثُمَّ غَرَسَ عَلى هَذا واحِداً وَعَلى هذا واحِداً، ثُمَّ قالَ: لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُما مالَمْ يَيْبَسا ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: پێغەمبەرﷺ بە لای

دوو گۆڕدا ڕابرد، ئینجا فەرمووی: ئەم دوو مردووە سزا دەدرێن: یەکێکیان بە هۆی لوو زمانی، ئەوی تر خۆی لە میز نەدەپارست، ئینجا پێغەمبەرﷺ لقە دارخورمایەکی تەڕی کردە دوو پارچەو لە سەر هەر گۆڕێك پارچەیەکی داچەقاندو فەرمووی: تکام وایە:سزاکەیان لە سەر سوك بێ تا کاتێك لقە دارەکان وشك دەبن.

ئیمامی(النواوی) لە شەرحی ئەم حەدیسەدا دەفەرموێ: چونکە لە کاتی تەڕی دا تەسبیحات دەکەن‌و داری ووشکیش تەسبیحاتی نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِه ﴾، واتە: هەر شتێك هەیە، تەسبیحاتی خوا ئەکا. زۆرترینی زانایان دەفەرموون: مەبەست شتی زیندووەو درەختیش تا ووشك دەبێ هەر زیندووە...ئینجا دەفەرموێ: زانایان بە خێری دەزانن: قورئان لە لای گۆڕ بخوێندرێ، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە، چونکە بە هۆی تەسبیحاتی لقە درەختێك تکای سزا سوکبوون هەیە، کەوابوو: بە خوێندنی قورئان زیاتر تکا هەیە. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٣٣١) ب(٢).

﴿ وَاسْتَحَبَّ ابنُ عُمر رضي الله عنهما: أَنْ يُقْرَأَ عَلَى الْقَبْرِ بَعْدَالدَّفْنِ أَوَّلُ سُوْرَةِالْبَقَرَةِ وَخاتِمَتُها ﴾ رواه البيهقي باسنادحسن، واتە: (ابن عمر) بە خێری دەزانی: سەرەتای سورەتی(البقرة)و کۆتاییەکەی—لە دوای مردوو ناشتن— لە سەر گۆڕ بخوێندرێ.

هەروەها: ئیمامی (الشافعی) دەیفەرموو: خێرە نەختێك قورئان لە لای گۆڕ بخوێندرێ، وە ئەگەر گشت قورئان ختم بکەن باشە. بڕوانە (الاذكار) ل(١٣٧) و(هداية المرتاب) ل(٢٧).

ئیمام (احمد بن حنبل) دەفەرموێ: هەر کاتێك چوونە گۆڕستان، سورەتی (فاتحة)و (قل هو الله أحد)و هەردوو (قل أعوذ) بخوێنن‌و خێرەکەش بدەنە مردووەکان، چونکە خێرەکەیان پێ‌دەگا. بڕوانە (ارشاد العباد) ل(٤١) و(هداية المرتاب) ل(٢٧).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئێستا بۆت ئاشکرا بوو: درەختی گۆڕستان‌و خوێندنی قورئان، چۆن لە (حديث) وەرگیراوە، هەروەها دیاری کردنی (فاتحة)و (قل هو الله أحد) فەرموودەی ئیمام (أحمد)ە، بۆ بارسوکی موسوڵمانان، چونکە گشت موسوڵمانێك واجبە (فاتحة) بزانێ تا نوێژی دروست ببێ، سورەتەکانی تریش کورتن‌و زۆر کەس دەیانزانێ.

ئینجا بزانە:—جگە لە ئیمامی(شافعی)— سێ مەزهەبەکەی تر دەفەرموون: خێری قورئان خوێندن دەگاتە مردوو. زۆر لە پێشەوایانی مەزهەبی (شافعی)ش فەرموودەی ئەم سێ مەزهەبەیان هەڵبژاردوە. بڕوانە (تحفة المحتاج) ل(٧٣) ب(٧).

کەوابوو: پێشەوایانی هەر چوار مەزهەب، قورئان خوێندن لە سەر گۆڕ بە باش دادەنێن، بەڵام: لە وەدا جیاوازن: ئیمام (شافعی) باوەڕی وایە: ئەگەر لە سەر گۆڕ بخوێندرێ، سزای پێ لە سەر سوك دەبێ، چونکە بە هۆی قورئان خوێندن (السَّكِينَة) دێتە خوارەوە،

بەلام خێرەکەی پێناگا. سێ ئیمامەکەی تر باوەڕیان وایە: ئەگەر لە دەرەوەی گۆڕستانیش بخوێندرێ، خێرەکەی دەگاتە مردوەکە. والله اعلم.

## ﴿ گۆڕ لە ناو مزگەوتدا ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: چەند گەنجێك واتێگەیاندراون: ئەگەر گۆڕ لە مزگەوتێکدا هەبێ، نوێژکردنی تێدا دروست نیە، جا ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەو مزگەوتی پێغەمبەریش ﷺ دەگرێتەوە، ئینجا منیش لە ڕوونکردنەوەی ئەم باسەدا دەڵێم: گۆڕ لە مزگەوتدا، دوو شێوەی هەنە:

**یەکەم**: گۆڕەکە لە دەرەوەی (حَرَم)ی مزگەوت بێ: وەکو ژوورێکی تایبەت، یان حەوشی مزگەوت، ئینجا جیاوازی نیە ئەم گۆڕە: لە ڕاستە بێ، یان لە چەپە، یان لە قیبلە، یان لە پشتەوە، واتە: ئەم گۆڕە زیان بە نوێژکردن ناگەینێ، چونکە شوێنی گۆڕەکە (حَرَم)ی مزگەوت نیە، بەڵکو شوێنێکە سەر بە مزگەوتە: وەکو ژووری ئیمامو بانگدەرو شوێنی خۆ لێ شوشتنو دەستنوێژو ئاودەستخانە، واتە: مانەوە بە لەشی بە (جَنابَة)و میزکردن لەم شوێنانەدا دروستە، بەلام لە ناو (حَرَم)ی مزگەوتدا دروست نیە، کەوابوو: گۆڕەکانی ئێسای مزگەوتەکانی کوردستان لەم بابەتەنەو شوێنەکەیان هەرچەند سەر بە مزگەوت بێ، بەلام بە (حَرَم)ی مزگەوت داناندرێ.

**دووەم**: خودی گۆڕەکە بکرێتە مزگەوتو نوێژ لە سەر گۆڕەکە بکرێ، یان بکرێتە (قیبلە)=ڕووگەو بە مەبەستی ڕێزلێنانو بە گەورە زانین نوێژ لەوێ بکرێ، ئەمە حەرامە، بەڵکو ئەگەر بە مەبستی پەرستن بێ، پێ کافر دەبێ.

ئیمامی(النواوی)و (إبن حجرالهیتمی) دەفەرموون: نابێ بە هیچ جۆرێك نوێژ لە سەر گۆڕی پێغەمبەرو ﷺ پێغەمبەرەکانی تریش بکرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصارَى إتَّخَذُوا قُبورَ أَنْبِيائِهِم مَساجِد ﴾ رواه البخاری ومسلم، لەعنەتی خوا لە جوولەکانو گاورەکان بدا، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردۆتە مزگەوت. (الشروانی) دەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە: گۆڕ بکرێتە (قیبلە)ی نوێژو بە گەورەی بزانێ وەکو گەورەیی پەرستراو. بڕوانە (تحفة المحتاج وحاشية الشروانی) ل(١٥٢) ب(٣).

هەروەها لە شەرحی ئەم حەدیسەدا ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: زانایان فەرموویانە: بۆیێ پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە: گۆڕی ئەو و گۆڕی خەڵکی تر بکرێتە مزگەوت، لە ترسی زۆر بە گەورە زانینو بێشەرعی، چونکە زۆر جار ئەم بێ شەرعی یە سەر دەکێشی بۆ کافربوون، هەروەك ئوممەتەکانی ڕابردوو وایان بە سەر هاتوە، جا لە کاتێکدا- کە موسوڵمانان زۆر بوون- (صحابة)و (تابعين) پێویستیان بە گەورەکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بوو، ژوورەکانی (أُمّهات المؤمنین)=ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ بە گەڵ (حَرَم)ی

مزگەوت کەوتن، جا یەکێك لەم ژوورانەش ژوورەکەی حەزرەتی(عائشة) بوو، کە گۆڕی پێغەمبەروﷺ ئیمامی (أبوبکر)و ئیمامی (عمر)ی لە ناودا بوو، هەڵسان دیوارێکی بەرزیان لە دەورەی گۆڕەکەی دروست کرد، تاکو دیار نەبێ، نەوەکو خەڵك نوێژی بەرەولا بکەن‌و تووشی بێشەرعی ببن. بڕوانە (شرح مسلم) ل(١٧٧) ب(٣).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم کردارەی (صحابة)و (تابعین) بەڵگەیە: ئەگەر گۆڕ لە ناو (حرم)ی مزگەوتیشدا بێ، بەڵام دیواری تایبەتی خۆی هەبێ، زیانی نیە، هەروەکو گۆڕی پێغەمبەرﷺ ئێستا ئەوهایە، کەواتە: ئەگەر لە دەرەوەی (حَرَم)ی مزگەوت بێ، هەر زیانی نیە.

کەوابوو: ئەی لاوی موسوڵمان: ئێمەی (أهل السنة) وەکو جووەکان‌و گاورەکان (عابِدُ القُبُور)=گۆڕپەرست نین، وەکو (خوارج)ش (أَعْداءُ القبُوُر)=دوژمنی گۆڕەکان نین، بەڵکو بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ (زُوَّار القُبور)=زیارەتکاری گۆڕەکانین، جا لە کۆتایی دا دەڵێم: خۆزگە ئەوانەی ئەوەندە دژی مردووانن، نیو ئەوەندەش دژی زیندووە ستەمکارەکان بوبان، تاکو (حُکْم)ی خوایان گەڕاندباوە سەر زەمین .

## ﴿ دایك‌و باوکی پێغەمبەرﷺ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: زۆر چاك دەزانم: باسکردنی ئەم مەسەلەیە، خزمەتی ئیسلام ناکاو چارەی کێشەی نێوان موسوڵمانان ناکا، بەڵام ناچار بووم باسی بکەم؟ چونکە چەند کەسێك بە شانازییەوە ووتار دەدەن‌و دەڵێن: (دایك‌و باوکی پێغەمبەرﷺ کافرن‌و لە دۆزەخدان). ئەم گۆتە ناشیرنە بە پێچەوانەی ئایینی ئیسلام‌و ئەو ڕەووشتە جوانەیە: کە موسوڵمانان بەرانبەر منداڵەکانی خۆیان ڕەفتاری پێئەکەن: کە هەر لە منداڵیەوە ناوی پێغەمبەروﷺ ناوی دایك‌و باوکی پێغەمبەریان فێر دەکەن، تاکو خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ لە ناو دڵیاندا جێگیر ببێ.

بەڵام بە پێچەوانەوە: ئەم جۆرە کەسانە کافرکردنی دایك‌و باوکی پێغەمبەرﷺ بە بەشێك لە بانگەوازی خۆیان دادەنێن، جا هاوارم بۆ لای خوای گەورە: منداڵێك لە منداڵیەوە فێر بکرێ: کە پێغەمبەرﷺ کوڕی کافرانە-نعوذ بالله- ئاخۆ چۆن بیر لە پێغەمبەرﷺ بکاتەوەو چۆن خۆشەویستی پێغەمبەری لە ناو دڵدا جێگیر دەبێ؟!.

ئەی لاوی موسوڵمان: هیچ کەسێك بەوە ڕازی نیە، پێی بگوترێ: ( کافرباوك، یان کوڕەکافر) ئەی ئەوە چ ئیمانێکە کە ڕازی بین: بە پێغەمبەرمانﷺ بگوترێ: (کوڕەکافر) یان (کافرباوك)؟!

پرسیار لە قازی (أبوبکر ابن العربی المالکی) کرا: دەربارەی پیاوێك کە گوتی: (باوکی پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخدایە)؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەم پیاوە (مەلعونە)، واتە لەعنەت لێکراوە، چونکەخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي

الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ ﴾(الأحزاب: ٥٧)، واتە: بە ڕاستی ئەوانەی خواو پێغەمبەریخوا ﷺ ئازار دەدەن، خوایگەورە لەعنەتی لێ کردون لە دنیاو قیامەتدا. ئینجا فەرمووی: هیچ ئازارێك لەوە گەورەتر نیە: کە دەربارەی باوکی پێغەمبەر ﷺ بگوترێ: (باوکی پێغەمبەر ﷺ لە دۆزەخدایە). بڕوانە ( الحاوی للفتاوی) ل(٤٠١) ب(٢).

ئەی لاوی موسوڵمان: لە بەر ئەوەی ئەم گۆتە ناشیرنە–بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ– ئێستا بە ووتارو بە نووسراو بڵاو دەکرێتەوەو خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ کەم دەکاتەوە لە ناو دڵی موسوڵمانانەدا، بە پێویستی دەزانم ئەوە ڕوون بکەمەوە: کە دایكو باوکی پێغەمبەر ﷺ کافر نین، دۆزەخیش نین.

(بیجوری) دەفەرموێ: مەزهەبی ڕاست ئەوەیە: (کە (اهل الفترة) واتە: ئەوانەی لە سەردەمی نێوان پێغەمبەرەکاندانە، یان لە سەردەمی پێغەمبەرێکی وەهانە: کە بۆ ئەوان نەنێردراوە، گشتیان ڕزگاربوونە لە دۆزەخ، هەر چەند گۆڕانکاریشیان کردبێ‌و بتیشیان پەرستبێ.

ئینجا دەفەرموێ: ئەو حەدیسانەی وادەگەیێنن: کە (أهل الفترة) لە دۆزەخدانە بە ڕوەستی ئایەتی قورئان ناکەن، کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الاسراء:١٥)، واتە: ئێمە هیچ کەسێك سزا نادەین تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین.

ئینجا دەفەرموێ: کە ئەمەت زانی، ئەوەش دەزانی: کە دایكو باوکی پێغەمبەر ﷺ ڕزگاربوونە لە دۆزەخ، چونکە ئەوانیش لە (أهل الفترة)ن، بەڵکو گشت باپیرەو داپیرەکانیشی ڕزگاربوو و ئیماندارن، کافربوون‌و پیسی ی(جاهلیة) تووشی ئەوان نەبوە، بە چەند بەڵگەیەکی قورئان‌و حەدیس. بڕوانە (تحفة المرید) ل(١٧). هەروەها (غایة المأمول علی التاج الجامع للاصول) ل(١٩٨–١٩٩) ب(٥).

ئیمام (فخرالدین الرازی)و (جلال الدین السیوطی) بەڵگەیان بەم حەدیسانە هێناوەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ لَمْ يَزَلِ اللهُ يَنْقُلُنِي مِنَ الأَصْلابِ الطَّيِّبَةِ إِلَى الأَرْحَامِ الطَّاهِرَةِ ﴾ اخرجه ابو نعیم وابن ابی عمر العدني فی مسنده، واتە: بەردەوام خوای گەورە منی دەگواستەوە لە پشتی پیاوانی پاك، بۆ منداڵدانەی ئافرەتانی پاك.

خوای گەورەش دەربارەی کافرەکان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ ﴾التوبة(٢٨)، کافرەکان پیسن. کەواتە: ئەگەر دایك و باوکی پێغەمبەر ﷺ کافر بوبن، نەدەبو پێغەمبەر ﷺ بە (الطاهرة)=پاك، باسیان بکا، چونکە کافر پاك نیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللهَ حِينَ خَلَقَنِي جَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ خَلْقِهِ، ثُمَّ حِينَ خَلَقَ الْقَبَائِلَ جَعَلَنِي مِنْ خَيْرِهِمْ قَبِيلَةً، وَحِينَ خَلَقَ الأَنْفُسَ جَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ أَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ حِينَ خَلَقَ الْبُيُوتَ جَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ بُيُوتِهِمْ فَأَنَا خَيْرُهُمْ بَيْتاً وَخَيْرُهُمْ نَفْساً ﴾ أخرجه

البيهقي والترمذي وحسنه، واته: له كاتێكدا خواى گهوره ويستى دروستم بكا، له باشترين دروستكراوى خۆى دروستى كردم، ئينجا كه هۆزەكانى دروست كردن، منى له باشترين هۆز دروست كرد، كاتێك گيانى دروست كردن، گيانى منى كرده باشترين گيان، ئينجا كه بنەماڵەى دروست كردن، منى له باشترين بنەماڵه دروست كرد، كەوابوو: من له لايەنى بنەماڵەو له لايەنى گيان، له هەموو كەس باشترم.

له حەديسێكى تردا دەفەرموێ: ﴿ أَنا خَيْرُكُمْ نَفْساً وَخَيْرُكُمْ أَباً ﴾ اخرجه البيهقى وابن عساكر، واته: من له هەمووتان باشترم: له لايەنى گيانو له لايەنى باوكەوه.

له حەديسێكى تردا دەفەرموێ: ﴿ فَأَنَا مِنْ خِيارٍ إِلى خِيارٍ ﴾أخرجه البيهقى والطبراني، واته: من له بژاردەى باش تا بژاردەى باش له دايك بويمه.

خواى گەورەش دەربارەى كافرەكان دەفەرموێ: ﴿ أُولئِكَ هُمْ شَرُّالْبَرِيَّة ﴾ كافرەكان خراپترين خەڵكن. هەروەها دەربارەى ئيمانداران دەفەرموێ: ﴿ أُولئِكَ هُمْ خَيْرُالْبَرِيَّة ﴾ البينة (٦-٧)، ئيمانداران باشترين خەڵكن. كەواتە: ئەگەر دايكو باوكى پێغەمبەرﷺ كافر بوبن، نەدەبو پێغەمبەرﷺ به (خَيْر)=باشترو به (خيار)=بژاردە، باسيان بكا، چونكه كافر به هيچ جۆرێك باش نيه، كەوابوو: (خَيْر)=باشتريش نيه، بەڵكو (شَرُّ البرِيَّة)يه=خراپترينى خەڵكه، جا تكايه بۆ زياتر شارەزابوون لەم باسه، بڕوانه (الحاوى للفتاوى) دانراوى ئيمام (جلال الدين السيوطي) ل(٣٥٣-٣٥٤)و(٣٦٧-٣٧٠) ب(٢).

## ﴿ پرسيارو وەڵام ﴾

ئەى لاوى موسوڵمان: مافت هەيه پرسيار بكەى: ئايا دەربارەى ئەم حەديسه وەڵام چيه؟: ﴿ عن أبىهريرةﷺ: قال النَّبيُّﷺ: إِسْتَأْذَنْتُ رَبِّى أَنْ أَسْتَغْفِرَ لأُمِّى فَلَمْ يَأْذَن لِى وَاسْتَأْذَنْتُهُ أَنْ أَزُورَها فَأَذِنَ لِى ﴾رواه مسلم، تكام له خواى گەوره كرد: ئيزنم بدا بۆ دايكم بپاڕێمەوه خوا لێ ى خۆش ببێ، بەڵام خوا ئيزنى نەدام، تكاى ئيزنم لێ كرد زيارەتى گۆڕەكەى بكەم، ئيزنى دام.

**وەڵام**: ئيزننەدان نابێته بەڵگه، كه بڵێين: دايكى پێغەمبەرﷺ له دۆزەخدايه، بەڵكو دەتوانين بڵێين: تاوانى نەبوه، چونكه نەگەيشتۆته سەردەمى پێغەمبەرﷺ، جگه له مەش: حەديسى (صحيح) بەروەستى قورئان ناكا-هەروەك باسى دەكەين-. بڕوانه (البدعة) ل(١٦٦).

هەروەها: مافت به دەسته پرسيار بكەى: ئايا دەربارەى ئەم حەديسه وەڵامت چى يه؟: ﴿عن أنسﷺ أَنَّ رَجُلاً قال: يارسولَ الله أَيْنَ أَبى؟ قالَ: أَبُوكَ فِى النَّار، فَلَمّا قَفَّى قالَ النَّبيُّﷺ: إِنَّ أَبِى وَأَبَاكَ فِى النَّارِ﴾رواه مسلم وابوداود، پياوێك پرسيارى له پێغەمبەرﷺ كرد: باوكم له كوێيه؟ فەرموى: باوكت له دۆزەخدايه، جا كه پياوەكه ڕۆيشت، پێغەمبەرﷺ پێ ى فەرموو: باوكى منو باوكى تۆ له دۆزەخدانه.:

**وەلاّم:** ڕاستە ئەم حەدیسەو حەدیسەکەی تر، هەردووکیان (صحیح)ن، بەلاّم واتەی ئاشکرایان مەبەست نیە، هەروەك ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: (مَتى خـالَفَ خَبَرُالآحَـادِ نَـصَّ الْقُـرآنِ أَوْ إجْماعـاً وَجَـبَ تَـرْكُ ظَـاهِرِهِ) هـەر کاتێـك حەدیـسێکی (صـحیح)-کـە لـە ڕێگـەی ژمارەیەکیدیارکراوڕا گێڕدرابێتـەوە- دژایـەتی لەگـەڵ دەققـی قورئـان، یـان لەگـەڵ (إجمـاع) هەبوو، واجبە لە واتەی ئاشکرایخۆی واز بهێندرێ. (المجموع شرح المهذب) ل(٣٤٢) بـ(٤).

کەوابوو: حەدیسەکەی تـر-کـە پاڕانـەوەی لێ قەدەغـە کراوەو- ئـەم حەدیـسەش: کـە دەفەرموێ: باوکی منو باوکی تۆ لەدۆزەخ دانە، هەردووکیان حەدیسێکی ڕاسـتن، بـەلاّم دژایەتییان هەیە لەگەڵ ئایەتی ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُـولاً ﴾(الاسـراء:١٥)، ئێمە هیچ کەسێك سزا نادەین تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرن.

واتە: خـۆ لـە سـەردەمی دایـكو بـاوکی پێغەمبـەرداﷺ هـیچ پێغەمبـەرێك نـەبو، چـونکە پێغەمبەرانی پێشوو-علیهم الصلاة والسلام- تایبەتی بـون، پێغەمبـەری خۆشمـانﷺ هـەر لـە زگـی دایکی دا بووە کە باوکی وەفاتی کردوەو شەش ساڵان بووە کە دایکی وەفاتی کرد.

کەوابوو: ئایەتەکە دەیانگرێتەوەو واجبە ڕەفتاری پـێبکرێ و واتەیـەکی تـریش بـۆ ئـەم حەدیسە بدۆزرێتەوەو بڵێین: یان حەدیسەکە بە ئایەتەکـە (نـسخ) کراوەتـەوە-هـەروەك کۆمەڵێك وایان فەرمووە- یان بڵـێین: مەبەسـت بـاوکی خـۆی نـەبوە، بـەڵکو مەبەسـتی (أبیطالب)ی مامی بووە، چونکە یارمەتی دەداو بەخێوی دەکردو بە کوڕی .خۆی نـاوی دەهێنا، هەروەك لە ڕووداوەکەی (بحیرا)دا ئەمە ئاشکرا دەبێ. بڕوانە (الحاوی للفتـاوی) ل(٢٩٥-٢٩٦) ب(٢) و(غاية المأمول) ل(١٩٨)ب(٥).

جگە لەمەش ئەگەر بڵێن: حەزرەتی (إبراهیم)پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوانیش ناردراوە، دیسان ووشەی (فی النار) هەر نابێتە بەڵگە: لە سەر کافربوونی باوکی پێغەمبەرﷺ، چونکە مەرج نیە: هەرکەسێك لە دۆزەخدابێ، بە کافر دابندرێ، بەڵکو ئیمانداری گوناهباریش دەخرێتە دۆزەخ، ئەگەر خوا حەز بکا.

ئینجا ئەمەش چەند شیعرێکی دایكو باوکی پێغەمبەرەﷺ کە بەڵگەنە لە سەر ئیمانداریيان:
کاتێك (عبدالله)ی باوکی پێغەمبەرﷺ ئافرەتێك هاتـە ڕێگـەیو پـێی گـوت: (بێشـەرعیم لەگەڵدا بکە)!. (عبدالله) وەلاّمی داوەو فەرمووی:

أمَّا الْحَرامُ فَالْـمَماتُ دُونَهُ　　وَالْحِلُّ لاحِلَّ فَأَسْتَبِينَهُ
يَحْمِي الْكَرِيمُ عِرْضَهُ وَدِينَهُ　　فَكَيْفَ بِالأَمْرِالَّذِي تَبْغِينَهُ

أخرجه أبو نعيم والخرائطي وابن عساكر.

هـــەروەها (آمنــــة)ی دایکـــی پێغەمبـــەرﷺ لـــە نەخۆشـــی مردنـــدا فـــەرمووی:

بارَكَ اللّـهُ فـيكَ مـِنْ غُـلامِ يا ابْنَ الَّذى مِنْ حَوْمَةِ الْحِمامِ
نَجا بِعَـوْنِ الْـمَلِكِ الْـعَلاّمِ فَوُدِيَ غَداةَ الضَّرب بِالسِّهامِ
بِـمِـأَةٍ مِـنْ إبِـلٍ سِوامِ إنْ صحَّ ما أبْصَرْتُ فِى الْمَنامِ
فَأنْتَ مَبْعُوثٌ إلَى الأنامِ مِنْ عِنْدِ ذِيالْجَلالِ وَالإكْرامِ
تُبْعَثُ فِيالْحِلِّ وَفِيالْحَرَامِ تُبْعَثُ بِالتَّحْقيقِ وَالإسْلامِ
دينِ أبِيكَ الْبَرِّ اَبْراهامِ فَاللّهُ نَهاكَ عَنِ الأصْنامِ
اَلاّ تُواليها مَعَ الأقْوامِ

أخرجه ابو نعيم، بروانه (الخصائص الكبرى) ل(٤٠ و ٧٩) ب(١).

## ﴿ باسى (تَوَسُّل)= پاڕانەوە لەخوا بە خاترى پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام ﴾

ئەى لاوى موسوڵمان: دەربارەى (تَوَسُّل)=پاڕانەوە لە خوا، بە خاترى پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام، يان بە خاترى پياوچاكان، ئەم خەڵكە سێ بەشە:

**يەكەم**: لە سنوور دەردەچن‌و باوەڕيان وايە: كە پێغەمبەرﷺ، يان پياوچاك دەسەڵاتيان هەيەو دەتوانن كارەكەيان بۆ بكەن. ئەم باوەڕە هەڵەيەو باوەڕى ئەو نەزانانەيە: كە ڕێبازى (شرك)يان گرتۆتەبەر، كەوابوو: واجبە ئەم هەڵەيەيان بۆ ڕاست بكرێتەوەو تێبگەيەندرێن: كە-جگە لە خوایگەورە- هيچ كەسێكى تر تواناى سوودان‌و زيان گەياندنى نيە.

**دووەم**: لە گەورەيى‌و ڕێزى پێغەمبەران‌وعليهم الصلاة والسلام پياوچاكان كەم دەكەنەوەو دەڵێن: دروست نيە: نە بە خاترى پێغەمبەرو نە بە خاترى پياوچاك لە خوا بپاڕێتەوە. ئەم باوەڕەش هەڵەيەو باوەڕى ئەم نەزانانەيە: كە ڕێبازى (خوارج)و (معتزلة)يان گرتۆتەبەر.

**سێيەم**: سنوورێك بۆ ئەم خاترانەيە دائەنێن‌و دەڵێن: دروستە موسوڵمان (تَوَسُّل) بكا، واتە: لە خوا بپاڕێتەوە: تاكو خوایگەورە-لە بەر خاترى پێغەمبەرﷺ، يان پياوچاك- كارێكى بۆ بكا، بەو مەرجەى باوەڕى وابێ: نە پێغەمبەروﷺ نە پياوچاك، دەسەڵاتى ئەم كارەيان نيە، بەڵكو ڕێزيان لە لاى خوا هەيەو خوا لە بەر خاترى ئەوان دوعايەكە قبوڵ دەكا. بەم جۆرە (تَوَسُّلْ) دروستەو سوننەتەو ڕێبازى (أهل السنة والجماعة)يە، ئەمەش بەڵگەكانە:

**١-[( توسل )= پاڕانەوە لە خوا، بە خاترى پێغەمبەرﷺ لە كاتى زيندوويى دا]**

﴿ عَنْ عثمان بن حُنَيْفٍ﵁: أَنَّ رَجُلاً ضَريرَالْبَصَرِ أَتَىالنَّبِيَّﷺ فَقال: اُدْعُ اللهَ أَنْ يُعافِيَنى، قالَ: إنْ شِئْتَ دَعَوْتُ وَإنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيرٌ لَكَ، قالَ: فَادْعُهُ، فَأمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ وَيَدْعُوَ بِهذاالدُّعاءِ: (اَللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍﷺ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، يا مُحَمَّدُ إنِّى تَوَجَّهْتُ بِكَ إلى رَبِّى فِى حاجَتِى هذه لِتُقْضَى لِى، أَللَّهُمَّ شَفِّعْهُ فِيَّ ﴾ رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، ورواه البخاري فى التأريخ، ورواه الحاكم

وصححه على شرط البخاري ومسلم، ورواه إبن خزيمة في صحيحه، ورواه الامام أحمد فـي مسنده، ورواه البيهقي في الدعوات بإسناد صحيح و زاد: ﴿ فَفَعَلَ الرَّجُلُ فَبَرَأَ ﴾.

واته: پیاوێکی کوێر به پێغەمبەری ﷺ گوت: دوعام بۆ بکه خوایگەوره چاوەکانم چاك بکاتەوه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر حەز بکەی دوعات بۆ دەکەم، ئەگەر سەبریش بگری بۆ تۆ باشتره. کوێرەکه گوتی: دوعام بۆ بکه. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد: دەستنوێژێکی جوان بشواو ئەم دوعایه بکا: (خوایه لێت دەپاڕێمەوەو ڕوو دەکەمه لای تۆ به خاتری پێغەمبەرت (محمد ﷺ) که پێغەمبەری ڕەحمەته، (یا محمد) من به خاتری تۆ ڕووم کرده لای خوا بۆ پێکهێنانی ئەم کارەم–تا چاوەکانم چاك بکاتەوه– خوایه: خاتری پێغەمبەر ﷺ وەربگره: له کارەکەمدا). ئینجا پیاوەکه ئەم دوعایەی کردو چاك بۆوه. بڕوانه (مفاهیم یجب ان تصحح) ل(١٢٧ و ١٢٨) و(حقیقه التوسل والوسیله) ل(٥٩و٦٠).

## ٢–﴿( توسل )= پاڕانەوه له خوا به خاتری پیاوچاکان ﴾

﴿ عن أنس رضي الله عنه: أَنَّ عُمَرَ رضي الله عنه إسْتَسْقَى بالْعَبَاس رضي الله عنه فَقالَ: اَللَّهُمَّ إنّا كُنَّا نَتَوسَّلُ إلَيْكَ بِنَبِيِّنا ﷺ فَتَسْقِينا، وَإنَّا نَتَوَسَّلُ إلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنا فَاسْقِنا، قـالَ: فَيُسْقَوْنَ ﴾ رواه البخاری، ئیمامی (عمر رضي الله عنه) دوعای بارانی کردو گوتی: (خوایه کاتی خۆی (توسل)=پاڕانەوەمان له تۆ دەکرد به خاتری پێغەمبەرمان ﷺ و بارانت بۆ دەباراندین، وا ئێستاش (توسل) به خاتری مامی پێغەمبەرمان ﷺ دەکەین، خوایه بارانمان بۆ ببارێنه). ئینجا بارانیان بۆ دەباری.

(**ئاگاداری**) دەقی ڕستەی (كُنّا نَتَوسَّلُ إلَيْـكَ بِنَبِيِّنـا) بەڵگەیه: که–جگه له پیاوه کوێرەکەی ڕابردوو– (صحابة)کانی تریش (توسل)یان به پێغەمبەر ﷺ کردوه.

ئینجا که (خـوارج)و (معتزلـه)ی ئـەم سەردەمه بەرامبەر ئـەم بەڵگه بەهێزانه خۆیان ڕاناگرن، دەست به گوتەگوتی پوچەڵ دەکەن و دەڵێن: (لـه بـەر ئـەوه ئیمامی(عمر رضي الله عنه) (توسل)ی به حەزرەتی (عباس)ی مامی پێغەمبەر ﷺ کردوه، چونکه پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردبو، (توسل)ش به مردوو دروست نیه، هەرچەند پێغەمبەریش بێ!.

ئێمەش له وەڵامدا دەڵێین: ئێمـەی (أهل السنة) باوەڕمـان وایـه: نـه مرۆڤـی زینـدوو و نه مرۆڤی مردوو توانای (خَلْق)=دروستکردنی هیچ شتێکیان نیه، کەوابوو: نـه زینـدوو و نه مردوو هیچیان نابنه (شریك)ی خوا، بەڵام مرۆڤی وا هەیه: به زیندوویی و به مردوویی (دۆستو خۆشەویستی خوایەو خاتری هەیه)، ئەمەش نابێته (شرك).

کەوابوو: گوتەی ئێوه گوتەیەکی بێبەڵگەیەو بوختانێکه به ئیمامی (عمر) ئەیکەن و بیرو هۆش مردووه ناتێگەیشتووەکانتان ئەیانەوێ: به هەوەسی خۆیان حەدیسێکی (صحیح) بمرێنن و لەکاری بێخن، ئەگینا: ووشەی (عَمِّ نَبِيِّنا) لەم حەدیسەدا، ڕوون و ئاشکرایه: که

حەزرەتی (عباس) لە بەر ئەوە خاترمەندە، چونکە مامی پێغەمبەرە ﷺ، هەروەك حەزرەتی (عباس) بە خۆیشی لە دوعایەکەی دا فەرمووی: ﴿ وَقَدْ تَوَجَّهَتْ بِيَ الْقَوْمُ إِلَيْكَ لِمَكانِي مِنْ نَبِيِّكَ ﷺ ﴾ اخرجه الزبير بن بكار فی الانساب، واتە: خوایە ئەم خەڵکە بە خاتری من ڕووی کردە لای تۆ، چونکە من شوێنی خزمایەتیم لە لای پێغەمبەرەکەت ﷺ هەیە. بڕوانە (سبل السلام) ل(٨١) ب(٢) و (حقیقه التوسل والوسیله) ل(٦٦) و(مفاهیم یجب ان تصحح) ل(١٥١).

کەواتە: ئەگەر ئیمامی(عمر رضی الله عنه) مەبەستی ڕێزلێنانو خاتری پێغەمبەر ﷺ نەبوایە لە دوای وەفاتیشی، ئەوە (صحابة)ی لە حەزرەتی (عباس رضی الله عنه) گەورەترو بەڕێزتر هەبوون: وەکو ئیمامی(عثمان)و ئیمامی (علی)...هتد رضی الله عنهم.

ئینجا -جگە لەمەش- بە پشتیوانی خوای گەورە ئەوا چەند حەدیسێکی (صحیح) دەهێنین: کە (توسل) بە پێغەمبەر ﷺ کراوە لە دوای وەفاتکردنی:

### (٣-﴿ (توسُّل) بە پێغەمبەر ﷺ لە دوای وەفاتکردنی ﴾

**یەکەم:** لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا رضی الله عنه (صحابة)-ڕاستەو خۆ- لە سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ تکای دوعایان لێ کردوە ﴿ عن مالك الدّار: أَصابَ النَّاسَ قَحْطٌ فِي زَمَنِ عُمَرَ رضی الله عنه، فَجاءَ رَجُلٌ-وَهُوَ بلالُ بنُ الْحرْث الْمُزنِيِ الصَّحابِيِ رضی الله عنه- إِلى قَبْرِ النَّبيِّ ﷺ فَقالَ: يا رَسُولَ اللهِ اسْتَسْقِ لأُمَّتِكَ فَإِنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا. فَأَتَى الرَّجُلَ فِي الْمَنامِ فقالَ: أَقْرِئْ عُمَرَ مِنِّي السَّلامَ وَأَخْبِرْهُ أَنَّهُمْ يُسْقَوْنَ، وَقُلْ لَهُ: عَلَيْكَ الْكَيْسَ الْكَيْسَ. فَأَتى الرَّجُلُ عُمَرَ فَأَخْبَرَهُ، فَبَكى عُمَرُ وَقالَ: يارَبِّ ما آلُوا إِلاَّ ما عَجَزْتُ عَنْهُ ﴾ رواه البهیقي وابن أبي شيبة باسناد صحيح، وذكره الحافظ العسقلاني في (فتح الباري: باب الاستسقاء)، والحافظ ابن كثير في (البداية والنهاية: عام (١٨)=الرمادة).

واتە: لە سەردەمی ئیمامی(عمر)دا رضی الله عنه قاتیو بێبارانی تووشی خەڵك بوو، ئینجا (صحابة)یەك-کە (بلال بن الحرث المزني) بوو- هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەرو ﷺ گوتی: (یارسول الله) دوعای باران بۆ ئوممەتت بکە، چونکە بە هیلاك چوون. ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاتە خەونی (صحابة)کەو فەرمووی: سەلامی من لە (عمر) بکەو پێ ڕابگەیەنە: بارانیان بۆ دەبارێو پێی بڵێ: با زیرەكو هۆشیاربێ، با زیرەكو هۆشیار بێ: بۆ کاروباری موسوڵمانان -واتە: با نوێژی باران بکا-. ئینجا (صحابة)کە ڕووداوەکەی بە ئیمامی(عمر) ڕاگەیاند، ئیمامی(عمر)ش دەستی بە گریان کردو فەرمووی: خوایە کەمتەرخەمی ناکەم لە کاروباری موسوڵماناندا، مەگەر شتێك لە توانامدا نەبێ.

جا ئەگەر (توسل) بە پێغەمبەر ﷺ لە دوای وەفاتیشی دروست نەبوایە، ئەوە ئیمامی (عمر) یەکسەر (صحابە)کەی ئاگادار دەکردەوەو نەدەگریا.

دووەم: ﴿ كانَ رَجُلٌ يَخْتَلِفُ إلى عُثْمانَ بن عفانﷺ في حاجَة لَهُ، وكان عُثْمانُ لا يَلْتَفِتُ إلَيْه، فَلَقِيَ الرَّجُلُ عُثمانَ بنَ حُنَيْف، فَشَكا إلَيْه ذَلكَ، فَقالَ لَهُ بنُ حُنَيْف: إئْتِ الْمِيضَأَةَ فَتَوَضَّأْ ثُمَّ ائْت الْمَسْجِدَ فَصَلِّ فيه رَكْعَتَيْن، ثُمَّ قُلْ: (اَللّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إلَيْكَ بنَبِيِّكَ محمدﷺ)...إلى آخرالدُّعاء، فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ وَصَنَعَ ماقالَ لَهُ، ثُمَّ أَتَى بابَ عُثْمانَ فَجاءَ الْبَوّابُ فَأَدْخَلَهُ عَلَى عُثْمانَ فَأَجْلَسَهُ مَعَهُ وَقالَ: ما حاجَتُكَ؟ فَذَكَرَ حاجَتَهُ فَقَضاها لَهُ، ثُمَّ إنَّ الرَّجُلَ لَقِيَ عُثْمانَ بنَ حُنَيْف وَقالَ لَهُ: جَزاكَ اللهُ خَيْراً، ما كانَ يَنْظُرُ فِيحاجَتي حَتَّى كَلَّمْتَهُ فِيَّ، فَقالَ عُثْمانُ بنُ حُنَيْف: وَاللهِ ما كَلَّمْتُهُ وَلكنْ شَهِدْتُ رَسُولَ اللهِﷺ وَأَتاهُ رَجُلٌ ضَرِيرُالْبَصَرِ فَشَكى إلَيْه ذَهابَ بَصَرِه... ﴾ إلى آخر الحديث السابق، رواه الطبراني وقال: والحديث صحيح، ورواه البيهقي بسند جيد، ونقله المنذري في الترغيب والترهيب، والحافظ الهيثمي في مجمع الزوائد، والامام السبكي في شفاء السقام.

واتە: پیاوێك دەچووە لای ئیمامی (عثمان) تاكو كارێكی بۆ پێك بێنێ، بەڵام ئیمامی (عثمان) گوێی نەدەدایێ، ئینجا پیاوەكە گەیشتە حەزرەتی (عثمان بن حنیف)و گلەیی كرد، ئەویش پێی گوت: برۆ دەستنوێژ بشۆ و دوو ڕەكعەت نوێژ لە مزگەوتدا بكە، ئینجا ئەم دوعایە بكە:–واتە: دوعای پیاوە كوێرەكەی ڕابردوو لە ژمارە(١)دا– ئینجا پیاوەكە وای كردو چووە لای ئیمامی (عثمان)و دەرگەوانەكە بردیە ژوورەوە، ئیمامی (عثمان) لە تەنیشت خۆی دایناو كارەكەشی بۆ پێك هێنا، ئینجا پیاوەكە هاتە دەرەوەو گەیشتەوە حەزرەتی (عثمان بن حنیف)و پێی گوت: خوا پاداشی چاكەت بداتەوە، تا ئەتۆ پێت نەگوت، كارەكەی بۆ پێك نەهێنام. حەزرەتی (عثمان بن حنیف) فەرمووی: والله من پێم نەگوتوە، بەڵام جارێك لە خزمەت پێغەمبەرﷺ بووم پیاوێكی كوێر هاتە لایو دەردی چاوەكانی خۆی بە پێغەمبەرﷺ ڕاگەیاند...تا كۆتایی حەدیسی پیاوە كوێرەكەی ڕابردوو: لە ژمارە(١)دا.

واتە: ئەم (صحابة)یە–(عثمان بن حنیف)– دوعای كوێرەكەی فێری پیاوەكە كرد، پیاوەكەش دوعایەكەی كرد، بەڵام هەر وای دەزانی: (صحابة)كە لە لای ئیمامی (عثمان) هەوڵی بۆ داوە، (صحابة)كەش سوێندی بۆ خوارد: كە هەوڵی بۆ نەداوە، بەڵكو بە هۆی (توسل) بە پێغەمبەرﷺ– لە دوای وەفاتكردنی– كارەكەی بۆ پێك هاتوە، بڕوانە (روضة المحتاجين) ل(٣٩٠) و(مفاهيم يجب ان تصحح) ل(١٢٩).

### ٤–﴿ (توسل) بە پێغەمبەرﷺ لە سەردەمی (السلف الصالح)دا ﴾

لە كاتێكدا خەلیفە (المنصورالعباسي) چووە حەج و زیارەتی گۆڕی پێغەمبەریﷺ كرد، پرسیاری لە ئیمام (مالك) كرد: ئایا ڕوو بكەمە قیبلەو دوعا بكەم، یان ڕوو بكەمە

پێغەمبەرﷺ؟ ئیمام (مالك) فەرمووی: (وَلِمَ تَصْرِفُ وَجْهَكَ عَنْهُ؟ وَهُوَ وَسِيلَتُكَ وَوَسِيلَةُ أَبِيكَ آدَمَ -عليه السلام- إِلَى اللهِ تَعالى، بَلْ إِسْتَقْبِلْهُ وَاسْتَشْفِعْ بِهِ فَيُشَفِّعْهُ اللهُ فِيكَ) رواه القاضي عياض المالكي فيالشفاء بإسناج صحيح رجاله ثقات، ونقله الامام السبكي في شفاء السقام، والامام القسطلاني في المواهب اللدينة، والإمام السمهودي في وفاء الوفاء، واتە: ئیمام (مالك) فەرمووی: بۆ چی ڕووی خۆت لە پێغەمبەرﷺ لادەدەی؟ خۆ پێغەمبەرﷺ خاترمەندی خۆتەو خاترمەندی (آدم)ی باوکتە لە لای خوایگەورە، ڕوو بکە پێغەمبەرﷺو داوای شەفاعەی لێ بکە، خوایگەورە تکاکردنی پێغەمبەرﷺ لە دەربارەی تۆ وەردەگری. بڕوانە (روضة المحتاجين) ل(٣٩٠) و(سيوف الله الأجلة) ل(٦٨) و(حقيقة التوسل والوسيلة) ل(٤١).

## ٥-﴿ (توسل) بە پێغەمبەرﷺ پێش لە دایکبوونی ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: کە ئیمام (مالك) دەفەرموێ: (وَهُوَ وَسِيلَتُكَ وَوَسِيلَةُ أَبِيكَ آدَمَ)-عليه السلام- پێغەمبەرﷺ خاترمەندی خۆتەو خاترمەندی(آدم)ی باوکتە. مەبەستی ئەم حەدیسەیە: ﴿ عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَمَّا اقْتَرَفَ آدَمُ الْخَطِيئَةَ، قال: يارَبِّ أَسْأَلُكَ بِحَقِّ مُحَمَّد لَما غَفَرْتَ لِي، فَقالَ اللهُ: يا آدَمُ وَكَيْفَ عَرَفْتَ مُحَمَّداً وَلَمْ أَخْلُقْهُ؟ قالَ يارَبِّ لأَنَّكَ لَمّا خَلَقْتَنِي بِيَدِكَ وَنَفَخْتَ فِيَّ مِنْ رُوحِكَ رَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ عَلى قَوائِمِ الْعَرْشِ مَكْتُوباً: (لاإلهَ إلاّاللهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)، فَعَلِمْتُ أَنَّكَ لَمْ تُضِفْ إلى إِسْمِكَ إِلاَّ أَحَبَّ الْخَلْقِ إِلَيْكَ، فَقالَ اللهُ صَدَقْتَ يا آدَمُ إِنَّهُ لأَحَبُّ الْخَلْقِ إِلَيَّ، أُدْعُنِي بِحَقِّهِ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ، وَلَوْلا مُحَمَّدٌ ما خَلَقْتُكَ ﴾ اخرجه الحاكم في المستدرك بإسناد صحيح، وابن عساكر في التأريخ، والحافظ السيوطي في الخصائص النبوية عن إبن عباس وصححه، ونقله الأمام السبكي في شفاء السقام، وصححه القسطلاني والزرقاني في المواهب اللدنية، ورواه البيهقي، وجاء من طريق آخر عن إبن عباس رضي الله عنه بلفظ: ﴿ فَلَوْلا مُحَمَّدٌ ما خَلَقْتُ آدَمَ وَلاالْجَنَّةَ وَلاالنّارَ ﴾ رواه الحاكم بإسناد صحيح، وصححه الامام البلقيني في فتاواه، ورواه الطبراني في الأوسط، قال الحافظ الهيثمي: فيه من لم أعرفهم، ونقله الأمام إبن كثير في البداية، بڕوانە (مفاهيم يجب ان تصحح) ل(١١٩و١٢٥) و(سيوف الله الأجلة) ل(٥٨و ٥٩) و(حقيقة التوسل والوسيلة) ل(٤٠ و ٤٩).

واتە: لە کاتێکدا باب (آدم) بە هۆی خواردنی لە دارەکەی بەهەشت تووشی تاوان بوو، لە خوا پاڕاوەو گوتی: (خوایە بۆ خاتری (مُحَمَّد) لە گوناهم خۆش ببە). خوای گەورە فەرمووی: (چۆن (مُحَمَّد)ت ناسیوە، خۆ هێشتا دروستم نەکردوە؟). باب (آدم) فەرمووی: خوایە کە منت دروست کردو گیانت هێنا ناو لاشەکەم، سەرم بەرزکردو دیتم: لە سەر پێچەکەکانی (عَرش) نوسراوە (لا إله إلا الله محمد رسول الله)، ئینجا زانیم: هیچ ناوێك

لەگەڵ ناوی پیرۆزی خۆت کۆ ناکەیەوە، تەنها ناوی خۆشەویسترین خەڵکی خۆت نەبێ، ئینجا خوای گەورە فەرمووی: ڕاست دەکەی: (مُحَمَّد)ﷺ خۆشەویسترین خەڵکە بە لامەوە، بە خاتری (مُحَمَّد)ﷺ لێم بپاڕێتەوە، بێگومان ئەوا لێت خۆش بووم، ئەگەر لە بەر (مُحَمَّد)ﷺ نەبوایە: تۆم دروست نەدەکرد.-لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ-: (ئەگەر لە بەر (مُحَمَّد)ﷺ نەبوایە: نە (آدم)و نە بەهەشتو نە دۆزەخم دروست نەدەکردن).

### ٦-﴿ (تَبَرُك) واتە: بەرەکەت وەرگرتن بە ئاسەواری پێغەمبەرﷺ﴾:

(تَبَرُّك) بەشێکە لە (تَوَسُّل)، چونکە مەبەست ئەوەیە: خوای گەورە بە بەرەکەتی ئاسەواری پێغەمبەرﷺ، یان پیاوچاك چاکەیەك بدا، یان خراپەیەك لاببا، هیچ جیاوازی کاتی زیندوویی‌و دوای وەفاتکردن نیە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسانە:

**یەکەم**: لە کاتی زیندوویی‌دا: ﴿عن عروة بن مسعود فی صُلْح الْحُدَيْبية: فَوَاللهِ ما تَنَخَّمَ رَسُولُ اللهِﷺ نَخامةً إلاّوَقَعَتْ في كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بها وَجْهَهُ﴾ رواه البخاري، واتە: سوێندم بە خوا پێغەمبەرﷺ هەر تفێکی فڕێ بدایە، (صحابە) دەستیان لە بەر دەگرتەوەو ئەکەوتە دەستی یەکێکیان‌و ڕووی خۆی پێ چەور دەکرد.

﴿عن أنسﷺ فی حجة الوداع: أنَّ النَّبِيَّ حَلَقَ رَأْسَهُ فَأَعْطَى شَعَرَهُ لأَبِي طَلْحَةَ فَوَزَّعَهُ: الشَّعَرَةَ وَالشَّعْرَتَيْنِ بَيْنَ النَّاسِ﴾ رواه مسلم، کە پێغەمبەرﷺ لەحەجی ماڵئاوایی سەری خۆی تاشی، مووەکانی دانە دەست (أبیطلحة) ئەویش دابەشی سەر (صحابة)کانی کرد: یەکێ یەك داوە موو، یان دوو داوە موو.

**دووەم**: لە دوای وەفاتکردنی: ﴿عن أسماءرضی‌الله‌عنها: هذه جُبَّةُ رَسُولِ اللهِﷺ، كانَ يَلْبَسُها فَنَحْنُ نَغْسِلُها لِلْمَرْضى يُسْتَشْفَى بِها﴾ رواه مسلم، (أسماء) فەرمووی: ئەمە (جبة)= کەوایەکەی پێغەمبەرەﷺ، کاتی خۆی دەیکردەبەر، ئێستاش ئێمە بۆ نەخۆشەکانی دەیشۆرین، تاکو بە ئاوشۆرەکەی شیفایان بۆبێ‌و چاك ببنەوە.

ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: کە بەرەکەت وەرگرتن سوننەتە بە ئاسەواری پیاوچاکان‌و جلەکانیان. (شرح مسلم) ل(٣٥٧) ب(٨).

و﴿عن عثمان: أَرْسَلَنِي أَهْلِي إلى أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّﷺ بقَدَحٍ ماء فيه شَعَرٌ مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّﷺ وَكانَ إِذا أَصابَ الإِنْسانَ عَيْنٌ أَوْ شَيْءٌ بَعَثَ إِلَيْها مخْضَبَهُ﴾ رواه البخاري، واتە: لە ماڵەوە منیان ناردە خزمەت (أم سلمة)ی خێزانی پێغەمبەرﷺو پیاڵە ئاوێکم پێ بوو، چەند مووێکی پێغەمبەرﷺ لە ناو پیاڵەکەدا بوو؟ ڕەفتاری خەڵك وابوو: ئەگەر چاوێنی، یان نەخۆشیەکیان تووش بوبایە: قاپێکیان دەناردە لای (أم سلمة)، تاکو مووەکانی پێغەمبەرﷺ بۆیان بخاتە ناو قاپە ئاوەکە بۆ شیفا هاتن. بڕوانە (ارشاد الساری شرح البخاري) ل(٤٦٥) ب(٨).

٧-(تَبَرُّك) بەرەكەت وەرگرتن لە شوێنەواری پێغەمبەرانو عليهم الصلاة والسلام پیاوچاكان)
خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِاللهِ إِنَّ اللهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ، هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ (آل عمران: ٣٧-٣٨)، واتە: هەر كاتێك حەزرەتی (زكریا)پێغەمبەرﷺ دەچووە لای حەزرەتی(مریم) -كە لە (میحراب)دا خوای دەپەرست- دەیبینێ: جۆرە خواردنێكی وای لە لایە: كە لەم كاتەو لەم شوێنەدا ئەم جۆرە خواردنە دەست نەدەكەوت، فەرمووی: ئەی (مریم) ئەم خواردنە لەكوێوە بۆ تۆ هاتوە؟ (مریم ) گوتی: لە لای خواوە بۆم هاتوە، بە ڕاستی خوای گەورە ئەگەر حەز بكا ڕزق دەداتە كەسێك بە بێژماردن، لێرەدا (زكریا) دوعای كردو گوتی: خوایە لە لای خۆت نەتەوەیەكی پاكم پێببەخشە، بە ڕاستی تۆ دوعا قبوڵ دەكەی. بڕوانە (تفسیر أبی السعود) ل(٢٣٢)ب(١).
واتە: حەزرەتی (زكریا) عليه السلام هەرچەند بە خۆی پێغەمبەر بوو، بەڵام كە دیتی: حەزرەتی (مریم) ئەوەندە ئافرەتێكی چاكەو ئەو (كرامة)ی هەیە، زانی (محراب) شوێنی خواپەرستنەو خواپەرستنەكەشی پیرۆزە، یەكسەر لەم شوێنە پیرۆزەدا دوعای كرد: تاكو زوتر قبوڵ ببێ.
﴿عن عبدالله بن عمررضي الله عنهما: أَنَّ النَّاسَ نَزَلُوا مَعَ رسـول اللهﷺ عَلىَ الْحجرِ أَرْضِ ثَمُودَ، فَاسْتَقَوْا مِنْ آبارِها وَعَجَنُوا بِهَا الْعَجِينَ فَأَمَرَهُمْﷺ: أَنْ يُهْرِيقُوا مااسْتَقَوْا وَيَعْلِفُوا الإِبِلَ الْعَجِينَ، وأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْتَقُوا مِنَ الْبِئْرِالَّتِي تَرِدُها النَّاقَـةُ ﴾رواه البخاري ومسلم، واتە: (صحابة)كان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لە خاكی (ثمود) دابەزین، ئینجا خەڵكە لە بیرەكان ئاویان هەڵێنجاو هەویریان پێ شێلا، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێكردن: ئاوەكە بڕژێننو هەویرەكەش بدەنە ووشترەكان، هەروەها فەرمانی پێكردن: لەو بیرە ئاو بێنن: كە وشترەكەی (صالح) پێغەمبەرﷺ ئاوی لێ دەخواردەوە.
واتە: چونكە بیرەكانی تر هی كافرەكانی غەزەب لێكراو بوون، پێویستە خۆمانی لێ بپارێزن، چونكە بیرەكەیتریش بە وشترەكەی (صالح) پێغەمبەرﷺ پیرۆز بوبوو، بەرەكەتی لێ وەردەگیرێ. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٤٤٠) ب(١٠).
جگە لەوانەش: شوێنەواری تر هەنە: وەكو (المسجدالحرام)و (المسجدالنبوی)وﷺ (المسجدالاقصی)و (مسجدالعشار)و (مسجد قباء)و (مقام ابراهیمﷺ)و (ماء زمزم)و (چەند بیرێكی تر لە مەدینە)، لە بەر درێژی نەماننوسین.

ئەی لاوی موسوڵمان: لە حەدیسەکەی کوژراوەکانی جەنگی(بدر)و لە حەدیسەکانی سەلامکردنی پێغەمبەرﷺ لەکاتی زیارەتیگۆڕستان، بۆمان دەردەکەوێ: کە گشت مردووێك-موسوڵمان و کافر- ژیانێکی (بَرْزَخِي)ی هەیەو ئاگاداری چەند ڕووداوێکی دونیایە، ئینجا چەند حەدیسێکی(صحیح)ش هەنە: کە پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- لە دوای وەفاتیان هەر زیندوون: بە ژیانێکی (بَرْزَخِي)، کە لەگەڵ ژیانی دونیادا جیایە، بەڵام ئاگاداری ڕووداوەکانی دونیانە:

بۆ نموونە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ اَلأَنْبِياءُ أَحْيـــاءٌ فِىقُبُـــورِهِمْ يُـــصَلُّونَ ﴾رواه أبويعلى وقال الأمامان المناوى والعزيـزى: وهوحديث صحيح، پێغەمبەرانﷺ زیندوونە لە گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن. واتە: چونکە ئەوان لە شەهیدان گەورەترن، شەهیدیش زیندووە لە لای خوا، بەڵام ژیانی ئەوان لە ئێمە دیار نیە، وەکو ژیانی مەلائیکەتان، بڕوانە (فيض القدير) ل(١٨٤) ب(٣) و(السراج المنير) ل(١٣٤) ب(٢)

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ رَأَيْتُنِي فِي جَمَاعَةٍ مِنَ الأَنْبِياءِ فَإِذا مُوسَى-عليه السلام- يُصَلِّي...وَإِذا عيسى بنُ مَرْيَمَ-عليه السلام- قَائِمٌ يُصَلِّي، وَإِذَا إِبْراهِيمُﷺ قـــائِمٌ يُـــصَلِّي... فَحانَتِ الصَّلاةُ فَأَمَّمْتُهُمْ...﴾ رواه مسلم فى حديث الإسراء، واتە: لە شەوی(معراج)دا خۆم لە ناو کۆمەڵێکی پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- دیت، تەماشام کرد: موسی پێغەمبەر و عیسی پێغەمبەر و إبراهیم پێغەمبەر-عليهم الصلاة والسلام- هەر یەکەیان بە پێوە نوێژی دەکرد، ئینجا کاتی نوێژ هات، منیش پێشنوێژیم بۆ کردن.

جگە لەمەش: (لە صحيح مسلم) لە حەدیسی (معراج)دا هاتوە: کە پێغەمبەرﷺ لە ئاسماندا حەزرەتی (موسی) پێغەمبەری-عليه السلام- دیتو پێی فەرمووی: بگەڕێوە لای خوای گەورە، داوای کەمکردنەوەی ئەو پەنجا نوێژەی لێ بکە. هەروەهاش لە (الأزرق)و لە (هَرْشَى) حەزرەتی (موسی)و حەزرەتی (یونس) پێغەمبەری دیتن: بۆ حەج کردن دەهاتن،صلى الله عليهم أجمعين، بڕوانە (شرح مسلم) ل(٦٨و ٧٦ و ٧٧) ب(٢).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوەش بزانە: پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ ژیانێکی (بَرْزَخِي)ی تەواوتری هەیە، بە جۆرێکی وەها: بەردەوام ئاگاداری کردارو گوفتاری ئوممەتی خۆیەتی، هەروەك لە حەدیسەکانی سەلاواتی ڕۆژی (جمعة)و زیارەتی گۆڕیپێغەمبەرﷺ هاتوە: پێغەمبەرﷺ سەلاواتی دەگاتیو وەڵامی سەلامیش دەداتەو. بڕوانە (التاج الجامع للاصول) ل(٢٩٢) ب(١)و (١٨٩) ب(٢).

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ حَيَاتِي خَيْرٌ لَكُمْ تُحَدِّثُونَ وَيُحَدَّثُ لَكُمْ، وَمَمَـــاتِي خَيْرٌ لَكُمْ تُعْرَضُ عَلَيَّ أَعْمالُكُمْ: فَما رَأَيْتُ مِنْ خَيْرٍ حَمِدْتُ اللهَ-تعالى-وَما رَأَيْتُ مِـنْ

شَرٍّ اِسْتَغْفَرْتُ اللهَ لَكُمْ ﴾رواه البزار ورجاله رجال الصحيح، وصححه الحافظ السيوطي في المعجزات والخصائص، وكذا القسطلاني شارح البخاري، ونص المناوي في فيض القدير بأنه صحيح، وكذا الزرقاني في شرح المواهب، والخفاجي في شرح الشفاء،
واتە: ژیانی من بۆ ئێوە باشە، چونكە ئێوە گفتوگۆ لەگەڵ مندا دەكەن‌و گفتوگۆشتان لەگەڵ دەكرێ، مردنیشم بۆ ئێوە باشە، چونكە كردەوەكانی ئێوە دەهێندرێتە بەر چاوم: هەر كردەوەیەكتان ببینم لە باشەكانە، من سوپاسی خوا دەكەم، هەر كردەوەیەكیشتان ببینم لە خراپەكانە، لە خوا دەپاڕێمەوە لێتان خۆش ببێ.
كەواتە: ئەم حەدیسە ڕاستە، بەڵگەیە: كە پێغەمبەرﷺ كردەوەمان دەزانێ‌و بۆمان لە خوا دەپاڕێتەوە: لە خراپەكانمان خۆش ببێ، كەوابوو: (توسل) پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ دروستە‌و ئاگاداریشەو لە خوایگەورەش دەپاڕێتەوە: كارەكەمان بۆ بكا، بڕوانە (فيض القدير) ل(٤٠١) ب(٣) و(مفاهيم يجب ان تصحح) ل(٢٥١و٢٥٢).
ئەی لاوی موسوڵمان: ووشەی (إِسْتَغْفَرْتُ اللهَ لَكُمْ) لەم حەدیسەدا، ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەكا: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوااللهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوااللهَ تَوَّاباً رَحِيماً ﴾(النساء:٦٤)، واتە: ئەگەر ئەوان ستەمیان لە خۆیان كرد بە تاوان كردن، جا هاتنە لای تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- ئینجا لە خوا پاڕانەوە: تا لە گوناهیان خۆش ببێ‌و پێغەمبەریشﷺ بۆیان پاڕاوە: تا خوا لێیان خۆش ببێ، دەبینن خوای گەورە تۆبەیان قبوڵ دەكاو ڕەحمیان پێ‌دەكا.
كەواتە: ئەم حەدیسە بەڵگەیە: كە ناوەڕۆكی ئەم ئایەتە پیرۆزە تایبەت نیە بە كاتی ژیانی پێغەمبەرﷺ بەڵكو دوای‌وەفاتیشی دەگرێتەوە. بڕوانە (روضةالمحتاجين) ل(٢٨٥و٢٨٦).
ئەی لاوی موسوڵمان: خوای گەورە، من‌و تۆ و دایك‌و باوكمان‌و سەرجەم خۆشەویستانمان بە بەر شەفاعەتی ئەو پێغەمبەرەﷺ بدا، لە سەرەتای باسی پێغەمبەری ئیسلامەوە تا ئێرە، بۆت ئاشكرا بوو: چەند پێغەمبەرێكی گەورەو بەڕێزە لە دونیاو قیامەتدا.
جا توخودا كوفر لەو كوفرە ناشیرنتر هەیە: كە (وهابی)یەكانی (خوارج) دەیانگوت: (عَصَايَ هَذِهِ خَيْرٌ مِنْ مُحَمَّدٍ لأنّي أنْتَفِعُ بِهَا، وَمُحَمَّدٌ قَدْ مَاتَ فَلَمْ يَبْقَ فِيهِ نَفْعٌ)، واتە: دارعەسایەكەی من لە (محمد)ﷺ باشترە چونكە سودی لێ وەردەگرم، (محمد)ش مردوەو سوودی نەماوە. نعوذ بالله، بڕوانە (روضة المحتاجين) ل(٢٨٥).
ئەی لاوی موسوڵمان: تكات لێ دەكەم هیچی تر گوێ مەدە قوتابیانی (همفر)ی ئینگلیزو (ریجنالد)ی فەرنسی، كە دەڵێن: (توسل)و زیارەتی پێغەمبەروﷺ سەلاوات لێدان (بدعة)یە، لەم گوتە ناشیرنانە بە ئاشكرایی دیارە: (وەهابی)یەكان‌و (سلفی)یەكانی (خوارج) گشتیان

بە پەیڕەو و بڕۆگرامی (ریجنالد)و (همفر) پەروەردە کراون‌و دوژمانایەتی پێغەمبەرﷺو خۆشەویستانی پێغەمبەرﷺ لە ناو دڵیاندا جێگیر بووە.

گومانت نەبێ: کە پێغەمبەرﷺ بە زیندوویی‌و بە مردوویی هەر پێغەمبەرەو هەر بەڕێزەو هەر خاترمەندەو هەر ئاگادارە، کەوابوو: تەنها بۆ پلەی خوایەتی بەرزی مەکەوە، ئیتر هەرچی دەربارەی ئەم بەڕێزە دەیڵێی، بیڵێ، چونکە لە گشت پێغەمبەرەکانی خوا-علیهم الصلاة والسلام- گەورترە، کەوابوو: لە گشت ئادەمیزادانی ترو (ملائکة)و جنۆکەش گەورەترە، هەروەك پێغەمبەرﷺ بەخۆی دەفەرموێ: ﴿ أَنَا سَيِّدُ وَلَد آدَمَ يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾ رواه مسلم، وزاد الترمذي: ﴿ وَلا فَخْرَ وَبِيَدِي لِواءُ الْحَمْدِ وَلا فَخْرَ، وَما مِنْ نبيٍّ يَوْمَئذٍ آدَمُ فَمَنْ سِواهُ إلاَّ تَحْتَ لِوائِي ﴾ واتە: من گەورەی نەتەوەی (آدَم)م لە ڕۆژی قیامەتدا، بە شانازی وا نالێم، ئاڵای سوپاس بە دەستی منەوەیە، بە شانازی وا نالێم، هەر پێغەمبەرێك هەیە (آدَم)و ئەوانی تریش-علیهم الصلاة والسلام- لە ڕۆژی قیامەت گشتیان لە ژێر ئاڵای منن.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ گەورەی هەموو خەڵکە لە دونیاو قیامەتدا، بەڵام بۆیێ لەم حەدیسەدا تەنها ناوی قیامەتی هێناوە، چونکە لە قیامەتدا گەورەیی ئەم بەڕێزە بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا دەبێ‌و ململانەی لەگەڵ ناکرێ، هەروەك کافرەکان لە دونیادا لەگەڵیان دەکرد. بڕوانە (شرح مسلم) ل(١٦٦) ب(٢) و (١٢٨) ب(٩).

ئیتر شەمشەمە کوێرەکانی (خوارج) لە ڕووناکی ئەم حەدیسە بێبەشن‌و دەڵێن: (دروست نیە: وشەی (سَيِّد) بۆ پێغەمبەرﷺ بگوترێ). ئینجا کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی ڕەش‌و سپی لێك دەرکەوتن، ئەوکاتە دەزانن: پێغەمبەرﷺ سەییدی دونیاو قیامەتە.

ئیتر خوا ڕەحم بە (البوصیری) بکا، کە لە مەدحی پێغەمبەرﷺ ئاماژە بۆ ئەم حەدیسانە دەکاو دەفەرموێ:

مُحَمَّدٌ سَيِّدُ الْكَوْنَيْنِ وَالثَّقَلَيْـ ... ـنِ وَالْفَرِيقَيْنِ مِنْ عُرْبٍ وَمِنْ عَجَمِ
فاقَ النَّبِيِّينَ فِي خَلْقٍ وَفِي خُلُقٍ ... وَلَمْ يُدانُوهُ فِي حِلْمٍ وَلا كَرَمِ
دَعْ ماادَّعَتْهُ النَّصارَى فِي نَبِيِّهِم ... وَاحْكُمْ بِما شِئْتَ مَدْحاً فِيه وَاحْتَكِمِ
فَإِنَّ فَضْلَ رَسُولِ اللهِ لَيْسَ لَهُ ... حَدٌّ، فَيُعْرِبَ عَنْهُ ناطِقٌ بِفَمِ
فَمَبْلَغُ الْعِلْمِ فِيهِ أَنَّه بَشَرٌ ... وَأَنَّهُ خَيْرُ خَلْقِ اللهِ كُلِّهِمِ

## ﴿ باسی ( مَوْلُود )=یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئیمام (ابن حجرالهیتمی) دەگێڕێتەوە: ئیمام (أبوشامة)ی مامۆستای ئیمامی(النواوی) فەرموویەتی: ((لە جوانترین بیدعەکانی ئێستامان، ئەو کردارەیە: کە هەموو ساڵێك لە ڕۆژی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ دەکرێ: لە خێرکردن‌و چاکەو دەربڕینی

خۆشی‌و ڕازاندنـەوە، ئـەم ڕەفتـارە– لەگـەڵ ئـەوەی چـاکەی لەگـەڵ هەژاراندا تێدایـە–
نیشانەشە: بۆ خۆشویستن‌و گەورەیی پێغەمبەرﷺ لە دڵی ئـەو کەسـەی ئـەم خێـرە دەکـاو
شـوکری خـوای گـەورە دەکـا لـە سـەر ئـەو نیعمەتـەی کـە پێغەمبـەرێکی هێناوەتـە دنیـاو
بە ڕەحمەت بۆ ئەو خەڵکەی ناردوە)). بڕوانە (فتح المبين شرح الأربعين) ل(٩٥).
هەروەها : ئیمام (جلال السيوطي) ئەفەرموێ: ((مەولودکردن ئەوەیە: خەڵك کۆ ببێتـەوەو
هەندێك قورئان بخوێندرێ‌و چەند بەسەرهاتێکی پێغەمبەرﷺ بۆ خەڵك بگێڕدرێتەوە، ئینجا
خواردنێکیان بدرێتی و بیخۆن‌و بڕۆن، لە مە زیاتر نەکەن، ئەم شـێوەیە (بدعـة حسنة)یـە،
ئەو کەسەی ئەیکا پاداشتی ئەدرێتەوە، چونکە ڕێز لێنانی پێغەمبەریﷺ تێدایەو دەربڕینی
خۆشی‌و شادی ی بە لەدایکبوونی پێغەمبەریﷺ تێدایە، جا یەکەم کەس کە مـەولودکردنی
پەیدا کرد، سوڵتان (مظفرالدين)ی گەورەی (أربيل)=هەولێر بوو)).
ئینجا هەر ئیمام (جلال الدين السيوطي) لە ئیمام (ابن حجر العسقلاني) ئەگێڕێتـەوە: کـە
فەرموویەتی: ((مولودکردن بیدعەیەو لە سەردەمی (السلف الصالح)دا نـەکراوە، بـەڵام–
لەگەڵ ئەوەشدا– شتی باش‌و خراپی تێدایە: جا هەر کەسێك شتە باشەکانی مولود بکاو
خۆی لە خراپەکانی بپارێزێ، ئەوە دەبێتە (بدعة حسنة)، ئەگەرنا: باش نیە.
جا فەرمووی: (بە ڕاستی من مەولودکردنم لە بنچینەی حەدیسی(الصحيحين) وەدەرهێناوە،
کە ئەمەیـە: ﴿ قَدِمَ النَّبِيُّﷺ الْمَدِينَةَ فَوَجَدَ الْيَهُودَ صِياماً يَومَ عاشُوراءَ، فَقَـالَﷺ لَهُـمْ:
ماهَذَاالْيَوْمُ الَّذى تَصُومُونَهُ؟ قَالُوا: هذا يَوْمٌ أَنْجَىاللهُ فِيه مُوسى-عليه السلام-وَقَوْمَهُ، وَغَـرِقَ
فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ، فَصامَهُ مُوسى شُكْراً فَنَحْنُ نَصُومُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: فَنَحْنُ أَحَقُّ بِمُوسـى
مِنْكُمْ، فَصامَهُ وَأَمَرَ بِصِيامِه ﴾رواه البخاري ومسلم، واتە: پێغەمبەرﷺ هاتە (مدينة)، دیتـی
جووەکان لە ڕۆژی (عاشورا)دا بەرۆژوونە، پێغەمبەرﷺ لێ ی پرسین: ئەم ڕۆژە چیيە ئێوە
تێیدا بەڕۆژوو دەبن؟ گوتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە: کە خوای گەورە (موسى) پێغەمبەرو-عليه السلام- گەلەکەی تێدا ڕزگار کردون، (فرعون)و گەلەکەشی لە دەریادا خنکان، جـا حـەزرەتی
(موسى)-عليه السلام- بۆ شوکری خودا لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوو بـوو، ئێمـەش بـەرۆژوو دەبـین. جا
پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئێمە نزیکترو شـیاوترین بـە (موسـى) لـە ئێـوە. ئینجـا پێغەمبـەرﷺ
لە (عاشورا)دا بەرۆژوو بوو، فەرمانیشی دا: موسوڵمانان تێیدا بەرۆژوو بن.
ئینجا دەفەرموێ: لەم حەدیسە وەردەگیرێ: کـە شـوکری خوایگـەورە بکـرێ: لـە سـەر
ئەوەی لە ڕۆژێکی دیـارکراودا خۆشـیەکی داوە، یـان ناخۆشیەکی لابـردوەو، لـە هـەمان
ڕۆژیشدا هەموو ساڵێك ئەم شوکرە دووبارە بکرێتەوە، شوکری خوای گەورەش بە هەموو
جۆرە خواپەرستی یەك دێتە جـێ: وەکـو سـوجدەو ڕۆژوو و خێرکـردن‌و قورئانخوێنـدن،

ئینجا ئایا کام (نعمة)و خۆشی گەورەترە: لە (نعمة)و خۆشیی هاتنە دونیای پێغەمبەری ڕەحمەتﷺ لەم ڕۆژەدا؟ کەوابوو: پێویستە لە خودی ڕۆژەکەدا–واتە: لە ڕۆژی دوانزەی مانگی(ربیع الاول)دا–مەولود بکرێ. بروانە (الحاوی للفتاوی) ل(٢٩٢و ٣٠٢) ب(١) و(حاشیة الشروانی) ل(٤٢٢) ب(٧).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم فەرموودەی ڕابردوو: کە مەولود (بدعة حسنة)یە فەرموودەی ئیمام (إبن حجرالعسقلانی) دانەری ( فتح الباری شرح البخاری) بوو، لە حەدیسی (البخاریو مسلم)ی وەرگرتوە، جگە لەوەش: پێغەمبەرﷺ هەر بەخۆی ڕێزی لە ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی ناوەو خواپەرستیو شوکری خوای تێداکردوە ﴿ عن أبي قتادةﷺ سُئلَ النَّبيُّﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الإثْنَيْنِ؟ فَقالَ: ذاكَ يَومٌ وُلِدْتُ فيهِ وَيَوْمٌ أُنْزِلَ عَلَيَّ فيــهِ ﴾رواه مسلم، لە بەڕۆژبوونی ڕۆژی دووشەممە پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا؟ ئەویش فەرمووی: دووشەممە ڕۆژێکی وەهایە من تێیدا لەدایك بووەمو هەر لە دووشەممەدا قورئانم بۆ هاتو بوومە پێغەمبەرﷺ.

جا کە پێغەمبەرﷺ بەخۆی لە هەموو حەفتەیەکدا بیرەوەری ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی بکا، چۆن بۆ ئێمە دروست نیە لە ساڵێکدا جارێك بیرەوەری ئەم ڕۆژە پڕ پیتوبەرەکەتە بکەین؟. ئیتر لە مە زیاتر چی ترت ئەوێ؟!.

جا ئەگەر فەریکەخوێندەوارێکی(خوارج) گوتی: فەرموودەی (ابن حجر) ڕاست نیەو مەولودکردن (بدعة قبیحة)یە. لە وەڵامی دا بڵێ: بڕۆ بەو لاوە، کەینێ کرمە ڕەشکەی بن دیواری (البدعةو الضلالة) دێتە ڕێزی نەڕەشێری مەیدانی (السنة والجماعة)؟!.

خۆ شتێکی ئاشکرایە: پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ چەند بە ڕزگاربوونی حەزرەتی (موسی)پێغەمبەر–علیه السلام– دڵخۆش بوو و شوکری خوای گەورەی لە سەر ئەم دڵخۆشیە کردو لە (عاشورا)دا بەڕۆژوو بوو، بۆ ئێمەشی بە (سنة) دانا تێیدا بەڕۆژوو ببین. کەوابوو: دەبی ئێمەش بە هاتنە دونیای پێغەمبەرمانﷺ دڵخۆش ببینو شوکری خوای لە سەر بکەین، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ گەورەی هەموو پێغەمبەرانە–علیهم الصلاة والسلام– ڕزگارکەری ئادەمیزادو جنۆکەیە لە تاریکی کوفرو ئاگری دۆزەخ.

## ﴿ سەلاوات لێدان لە دوای بانگو ئیقامەت ﴾

**١–سەلاوات لێدان لە دوای بانگ،** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ إذا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مايَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً صَلَّىاللهُ عَلَيْهِ بِها عَشْراً، ثُمَّ سَــلُوا اللهَ لِيَ الْوَسيلَةَ، فَإنَّها مَنْزِلَةٌ فِيالْجَنَّةِ لا يَنْبَغي إلاّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبادِاللهِ، وَأَرْجُوا أَنْ أَكُونَ أَنا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفاعَةُ ﴾رواه مسلم وابوداودوالترمذي،واتە: کاتێك گوێتان لە

بانگدەر بوو، ئێوەش وەکو بانگدەر بیڵێن–واتە: وەڵامی بانگ بدەنەوە–، ئینجا سەلاوات لە سەر من لێ بدەن چونکە هەر کەسێك یەك سەلاواتم لە سەر لێ بدا، خوایگەورە دە ڕەحمەتی بە سەردا دەبارێنێ، ئینجا دوعای (وَسِيلَة)م بۆ بکەن، چونکە (وَسِيلَة) پلەیەکە لە بەهەشتدا، تەنها بۆ یەك کەس لە بەندەکانی خوا داندراوە، تکام وایە: من ئەو بەندەیە بم، هەر کەسێك دوعای (وسيلَة)م بۆ بکا، مسۆگەر شەفاعەتی منی دەگاتێ.

ئەمەش دوعای (وسيلَة)یە، کە لە دوای سەلاواتی پاش بانگ دگوترێ:
﴿ اَللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَةالتَامَّة وَالصَّلاةالْقائمَة، آت مُحَمَّداً اَلْوسيلَةَ وَالْفَضيلَة، وَابْعَثْهُ مَقاماً مَحْمُوداً الَّذى وَعَدْتَهُ ﴾ رواه البخاري.

**٢-سەلاوات و دوعای (وَسِيلَة) لە دوای ئیقامەت:** ﴿ عن أبي هريرةﷺ: أَنَّهُ كَانَ إذا سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يُقيمُ الصَّلاةَ، يَقُولُ: اَللّهُمَّ رَبَّ هَذه الدَّعْوَةالتَّامَّة وَالصَّلاةالْقائمَة، صَلِّ عَلى مُحَمَّد وَآته سُؤْلَهُ يَوْمَ الْقيامَة ﴾ رواه ابن السني، واتە: هەرکاتێك (أبوهريرة) گوێی لێ بوایە: بانگدەر ئیقامەت دەکا، ئەویش لە دوای ئیقامەت–بەم وشانەی ڕابردوو– سەلاواتی لێ دەداو دوعای (وَسِيلَة)ی بۆ پێغەمبەرﷺ دەکرد. بڕوانە (الاذكار للنواوي) ل(٣١).

هەر بە بەڵگەی ئەم سێ حەدیسانە: ئیمامی (النواوي)و (إبن حجرالهيتمي) دەفەرموون: سوننەتە بانگدەرو ئیقامەتکەرو ئەوەی گوێی لەوانیشە: گشتیان لە دوای بانگو ئیقامەت سەلاوات لێ بدەن، ئینجا دوعای (وَسِيلَة)ش بکەن. بڕوانە (تحفة المحتاج) ل(٤٨٢) ب(١).

## ﴿ هیچی من و هیچی تۆ ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: کاتێك (خوارج) گوێیان لەم بەڵگە بەهێزانە دەبێ، هەر ئەوەندەیان پێ دەمێنێ، بڵێن: (خۆ پێغەمبەرﷺ نەیفەرمووە: بە دەنگ سەلاوات لێ بدەن!). تۆش لە وەڵامی دا بڵێ: (خۆ نەیفەرمووە: دەنگ بەرز مەکەنەوەو بە دەنگ لێمەدەن)، کەوابوو: **(هیچی من و هیچی تۆ).**

ئینجا بزانە: ئیمام (إبن حجرالهيتمي) دەفەرموێ: ئەم شێوە سەلاوات لێدانەی دوای بانگ (صلاح الدين) دایناوەو کارێکی باشە، خوا پاداشی چاکەی بداتەوە...ئینجا دەفەرموێ: مامۆستایانی ئێمە فتوایان داوە: سەلاواتی دوای بانگ سوننەتەو شێوەکەشی (بدعة)یە. بڕوانە (الفتاوىالفقهية) ل(١٣١) ب(١). واتە: (البدعةالحسنة)یە.

ئەی لاوی موسوڵمان: لەم فەرمودەیە بۆت ئاشکرا بوو: هەر بە هۆی دانانی (صلاح الدين الايوبي)یە، قوتابیانی (ريجنالد)ی (فرنسي) ڕقیان لە سەلاوات لێدانی دوای بانگ هەڵدەستێ، بە تایبەتی پێشەوای گومڕابوویان (محمد بن عبدالوهاب) کە دەیگوت: (انَّ الرَّبابة فى بيت الخاطئة -يعنى الزانية- اقلُ إثماً ممّن يُنادى بالصلاة على النّبيﷺ

عَلى الْمَنَائِرِ) واتە: دمبكچى لە ماڵى قەحپەدا تاوانى كەمترە لەو بانگدەرەى لە سەر منارەكان سەلاوات لێ دەدا لە سەر پێغەمبەرﷺ. بڕوانە (الدرر السنية) ل(٤١) و(روضة المحتاجين) ل(٣٨٤).

كەوابو: بە كوێرى چاوى ناحەزانى پێغەمبەرﷺ با بە يەكەوە شێوەى سەلاواتەكەى (صلاح الدين) بڵێين: (**أَلْفُ صَلاةٍ وَسَلامٍ عَلَيْك، عَلَيْكَ وعَلى آلِكَ وَأَصْحابِكَ يا سَيِّدَنا وَيا رسوُلَ الله**).

## ﴿ باسى قەزاكردنەوى نوێژ ﴾

ئەى لاوى موسوڵمان: بە (إجماع)=يەكدەنگى زانايانى ئيسلام، چينى (سلف)و (خلف)، واجبە: نوێژ قەزا بكرێتەوە، جياوازى نيە: ئەم نوێژە بە قەستى نەكرابێ، يان بە هۆى خەوتن، يان بە هۆى لە بيرچوون، يان بە هۆى رێگەنەدانى كەسێكى تر، بەڵگەش ئەم حەديسەيە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصلِّ إذا ذَكَرَهَا، لا كَفَّارَةَ لَها إلاَّ ذَلِكَ ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: هەر كەسێك لە بيرى چوو نوێژێك بكا، هەر كاتێك هاتەوە بيرى با نوێژەكە بكا، هيچ شتێك تاوانى نوێژە نەكراوەكە لانابا، تەنها كردنى نوێژێكى وەك خۆى تاوانەكە لادەبا. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٣٨١) ب(٣) و(إرشاد السارى شرح البخارى) ل(٥١٥) ب(١).

## ﴿ ڕوونكردنەوەيەك ﴾

لەم حەديسەى (بخارى ومسلم)دا پێغەمبەرﷺ فەرمووى: (لاَ كَفَّارَةَ لَها إلاَّ ذَلِكَ) هيچ شتێك تاوانى نوێژە نەكراوەكە لانابا، تەنها كردنى نوێژێكى وەك خۆى تاوانەكە لادەبا.

لەحەديسێكى تريشدا دەفەرموێ : ﴿ يَقُولُ رَبُّنا عَزَّ وَجَل لِمَلائكَتهِ-يَوْمَ الْقِيامَةِ-: أَتِمُّوا لِعَبْدِى فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ ﴾ رواه أبوداود والترمذي، خوايگەورە لە ڕۆژى قيامەتدا دەفەرموێتە فريشتەكانى: ناتەواوى نوێژە واجبەكانو زەكاتو...هتد، بۆ بەندەى من تەواو بكەن لە سوننەتەكانى.

جا لە بەر ئەوەى دژايەتى لە نێوان ئەم دوو حەديسەدا هەيەو حەديسەكەى يەكەم-كە لە (بخارىو مسلم)دايە- بەهێزتريشە لە حەديسەكەى دووەم، زانايان-بۆ لابردنى دژايەتى- دەفەرموون: مەبەست بە ناتەواوى، لە حەديسى دووەمدا ئەوەيە: كە لە دونيادا لە بيرى چووە (واتە: نەيزانيوە نوێژەكە ناتەواوە). ئيمامى (البيهقى)ش دەفەرموێ: تەنها سوننەتە ناتەواوەكانى ناو نوێژە واجبەكان، بە سوننەتەكانى تر تەواو دەكرێن، واتە: بە هيچ جۆرێك سوننەت جێگەى واجب پڕ ناكاتەوە. بڕوانە (تحفه المحتاج) ل(٢١٩) ب(٢).

ئەى لاوى موسوڵمان: دەبينى چەند فەريكە خوێندەوارێكى لە خوا نەترس، لە (إجماع) دەردەچنو حەديسى (بخارىومسلم) لەكار دێخنو بە هەواو هەوەسى خۆيان فەرموودەى

ئیمامی (البیهقی) ڕەد دەکەنەوە، دەڵێن: پێویست نیە نوێژ قەزا بکرێتەوە، ئەگەر بە قەستی نەیکردبێ، کەوابوو: لە وەڵامیاندا بڵێ: ئایا ڕەوایە: ئەو هەموو زانایانەی هەر چوار مەزهەبی (أهل السنة) بە هەڵەدا چوبن و لە ڕستەی (لاَ كَفَّارةً لَهَا إلاّ ذلكَ) تێنەگیشتبن! ؟ خۆ شتێکی ئاشکرایە: ووشەی (کفارة) —لە قورئان و حەدیسدا— بۆ داپۆشەری گوناهو لادەری سزاکەی بەکار دێ، بەڵام گۆتە پوچەڵەکەی ئێوە وا دەگەیەنێ: کە نوێژنەکەری بەقەستی پێوستی بەم (کفارة)ە نیە بۆ داپۆشینی گوناهەکەی!!! تاکو هەر بە گوناهباری بڕواتە دادگای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا.

ئەی لاوی موسوڵمان: لە چەند حەدیسێکی (بخاری و مسلم)دا هاتوە: کە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (خندق)دا نوێژی عەسری قەزا کردۆتەوە، لە غەزای (خیبر)دا لەگەڵ (صحابة)کان نوێژی سبەینەی قەزا کردۆتەوە، لە غەزای (بَنِي قُرَيْظَة)دا (صحابة) نوێژی عەسریان قەزا کردۆتەوە، جگە لەمەش: هەر لە حەدیسی (بخاری و مسلم)دا پێغەمبەرﷺ دەربارەی قەزاکردنەوەی ڕۆژوو و حەج دەفەرموێ: ﴿ فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى﴾و ﴿اُقْضُوا اللهَ فَاللهُ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ ﴾، واتە: قەرزی خوا لەپێشترە کە بدرێتەوە. قەرزی خوا بدەنەوە، چونکە خوا لەپێشترە قەرزی بدرێتەوە.

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەو نەفامانەی دەڵێن: نوێژ قەزامەکەوە، ئایا نوێژی نەکراو بە قەرزی خوا نازانن، یان —وەکو حەج و ڕۆژو— هەر بە ڕوکنی ئیسلامی دانانێن، ئایا ئەوانە لە خوا ناترسێن، ئەوانیش —وەکو (أبوجهل)— بەر ئەو هەڕەشەیە بکەون، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى عَبْداً إذا صَلَّى ﴾ إلى قوله: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللهَ يَرَى ﴾ ٩–١٤ (العلق)، واتە: پێم بڵێ: ئەو کەسەی بەندەی خوا لە نوێژکردن قەدەغە دەکا...ئایا نازانێ خوا دەیبینێ و سزای ئەم ڕەفتارە خراپەی دەداتەوە؟.

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەگەر کێشەکە تەنها لە سەر (نیة)هێنانە، ئەوە فەرموودەی بەهێزتری زۆرترین زانایان ئەوەیە: (نیەتهێنانی قەزاکردنەوە واجب نیە، بەڵکو سوننەتە). واتە: تەنها نیەتی نوێژکردن واجبە (نیەتهێنانیش تەنها بە دڵ واجبە، واتە: نیەتهێنان بە زوبان سوننەتە، تاکو زوبان یارمەتی دڵ بدا). بڕوانە (تحفة المحتاج) ل(٩و١٢) ب(٢).

## ﴿ چۆنیەتی هەڵسانەوە بۆ فاتیحە خوێندن ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەم حەدیسەی ﴿ عن ابن عباس رضي الله عنهما: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذا قَامَ فِي صَلاَتِهِ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى الأَرْضِ كَمَا يَضَعُ الْعَاجِنُ ﴾ کە پێغەمبەرﷺ بۆ فاتیحە خوێندن لە نوێژدا هەڵدەستاوە، دەستەکانی خۆی دادەنا سەر زەمین، وەك پیری بەساڵداچوو دایدەنێ.

ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: ئەمە حەدیسێکی بێهێزە، یان پوچەڵەو هیچ بنچینەیەکی

ڕاستی نیە. هەروەها ئیمام (إبن الحجر العسقلانی)ش دەفەرموێ: ئەم حەدیسە ڕاست نیەو دروست نیە بکرێتە بەڵگە.
جا هەردووکیان دەفەرموون: خۆ ئەگەر حەدیسەکە (صحیح)=ڕاستیش بێ، واتەی (العاجن): پیری بەساڵدا چووە، نەك هەویرشێل، کەوابوو: پەنجە نوقاندن لە کاتی هەڵسانەوە بۆ فاتیحە سوننەت نیە، بڕوانە (المجموع شرح المهذب) ل(٤٤٢) ب(٣) و(التلخیص الحبیر لابن حجر العسقلانی) ل(٤٩١) ب(٣).

## ﴿ جولاندنی پەنجە لە ( تحیات )دا ﴾

﴿ عن ابن الزبیر رضی الله عنهما: أَنَّهُﷺ كانَ يُشيرُ بِالسَّبَّابَةِ وَلا يُحَرِّكُها ﴾رواه احمد وأبوداود بإسناد صحیح، والنسائي وابن حبان ف صحیحه، وصححه البیهقی، واتە: پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بە پەنجەی شادە دەکردو نەیدەجولاند.
هەر بەبەڵگەی ئەم حەدیسە، ئیمامی (النواوی) لە (منهاج)دا دەفەرموێ: (وَيَرْفَعُها عِنْدَ قَوْلِهِ: إلاّ الله، وَلاَيُحَرِّكُها)، واتە: پەنجەی شادەی لە (تحیات)دا بەرز دەکاتەوە، لەو کاتەی دەڵێ: (إلاّ الله)و نایجولێنێ.
(ابن حجر الهیتمی) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (تا کۆتایی تەحیات پەنجەکەی دانانێتەوە، مەبەستیشی بەم ئاماژەیە ئەوە بێ: خوای پەرستراو تاكو تەنیایە: لە زاتو سیفەتو کرداردا، تاکو لەم یەکخواناسینەدا کۆ بکاتەوە: لە نێوان باوەڕی دڵو گوتەی زمانو کرداری پەنجەدا، تەنها پەنجەی شادەش بۆ ئاماژەکردن داندراوە، چونکە دەگاتەوە دەمارەکانی دڵ)...
ئینجا لە شەرحی (وَلا يُحَرِّكُها) دەفەرموێ: (لە کاتی بەرزکردنەوە نایجولێنێ، تاکو ببێتە شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ، هەروەها حەدیسی(صحیح)ی جولاندنیش هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی هەردوو حەدیسەکە پێکەوە کۆ بکرێنەوە-دەڵێین- مەبەست بەم جولاندنە: جولاندنی بەرزکردنەوەیە یەك جار-واتە: نەك جولاندنی بەردەوام-، چونکە فەرموودەیەك هەیە: جولاندنی بەردەوام حەرامەو نوێژ بەتاڵ دەکا، بۆیێ ئێمە دەڵێین: (جولاندنی ناپەسندە). (تحفةالمحتاج ) ل(٨٠) ب(٢)، هەروەها (سبل السلام) ل(١٨٩) ب(١).
ئەمەش حەدیسی جولاندنە: ﴿ عن وائلﷺ: أَنَّهُﷺ رَفَعَ أَصْبُعَهُ فَرَأَيْتُهُ يُحَرِّكُها يَدْعُو بِها﴾ رواه ابن خزیمة وغیره بسیند صیحیح، وصححه البیهقي. واتە: پێغەمبەرﷺ پەنجەی شادەی بەرز کردەوەو دیتم دەیجولاندو دوعای پێدەکرد.
ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: ئیمامی(البهیقی) فەرموویەتی: دەگونجێ مەبەست بە جولاندن: ئاماژە پێکردن بێ، نەك جولاندنی بەردەوام، کەوابوو: ئەم حەدیسە لەگەڵ حەدیسەکەی(ابن الزبیر) پێك دەگاتەوە. (المجموع شرح المهذب) ل(٤٣٣) ب(٢).

ئـەی لاوی موسـوڵمان: زانایـانی هـەر چـوار مەزهـەبی(أهـل السنة) –جگـە لـە ئیمـام (مالك)ﷺ– یەکدەنگن: لە سەر نەجولاندنی پەنجە، بەڵام ئیمام (مالك) دەفەرموێ: بەلای ڕاستەو چەپەدا دەیجولێنێ، بە جولاندێکی سوك.
ئیتر بۆت ئاشکرا بوو: زانایانی (حدیث)و (فقـه) ئـەم هـەردوو حەدیسـەیان بـە (صـحیح) داناون‌و لە دوای لێکۆڵینەوە لە هەردووکیان، بە ئەنجام گەیشتون.
لەگەڵ ئەوەشدا: (البانی)ی قین لەدڵ بەرامبەر بە (اهل السنة)–هـەروەك پیشـەی خـۆی– لە پەراوێزی لاپەڕە (١٤٠)ی (صـفة صـلاة الـنبیﷺ) چـاپی (١١)دا، هێرشـی بێئەدەبانـەی کردۆتە سەر پێشەوایانانی (أهل السنة)، جگە لەمەش حەدیسەکەی (ابن الزبیر)ی ڕابردووی بە (ضعیف) داناوەو هیچ ڕێزێکی بۆ ئەو ئیمامانە دانەناوە: کە حەدیسەکەیان بە (صـحیح) داناوە، ئەمەش خیانەتێکی گەورەیە، بەم خیانەتەش پەرتـەوازەو ململانەیـەکی وای لـە نـاو گەنجەکاندا دروست کردوە: کە زانست‌و کاری ڕۆژانەیان لە دەست چووە .
ئەی لاوی موسوڵمان: ئەوە باوەڕ دەکەی: کە (البانی) لە هەموو ئیمامەکانی (أهل السنة) لەخواترس‌تروو زاناتر بێ ! ؟ (مانگی شەوی چواردە پێویـستی بـە پـەنجـە نیـە)، کـەوابوو: (مەڕی لە مێگەڵ دابڕاو، خۆراکی گورگە).
(**ئاگاداری**): لە حەدیسێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿ لَهِيَ أَشَدُّ عَلى الشَّيْطانِ مِنَ الْحَدِيـــدِ، يَعْنِي السَّبَّابَةَ ﴾، پەنجەی شادە لە ئاسـن بـەهێزترە بـۆ دژایـەتی شـەیتان. واتـە: (هِـيَ) (ضمیر مؤنَّث)ەو بۆ (السّبابة) دەگەڕێتەوە، چونکە ئەویش (مؤنَّث)ە، نەك بۆ (التحریك)، چـونکە ووشـەیەکی (مُـذکّر)ە، هـەر وەك لـە (مـتن)ی حەدیسەکەدا دەفـەرموێ: (یعـنی السبابة)، واتە مەبەست بە (هِيَ)پەنجەی شادەیە، نەك جولاندن.

## ﴿ زیکرو دوعـای دوای نوێژ ﴾

پێغـەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَنْ سَبَّحَ اللّٰهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ ثَلاثاًوَثَلاثِينَ، وَحَمِدَاللّٰهَ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ، وَكَبَّرَاللّٰهَ ثَلاثاًوَثَلاثِينَ، وَقالَ تَمامَ الْمِأَةِ: لاإِلَهَ إِلاَّاللّٰهُ وَحْدَهُ لاشَـــرِيكَ لَـــهُ، لَـــهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ خَطاياهُ وَإِنْ كانَ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ﴾ رواه مسلم، وفي الترمذي: ﴿ لاإِلَهَ إِلاَّاللّٰهُ عَشْرَ مَرّاتٍ ﴾، واتە: هەرکەسێك لە دوای هـەموو نوێژێکدا، سی‌وسێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللّٰهِ)، سی‌وسێ جار بڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ)، سی‌وسێ جـار بڵێ: (اَللّٰهُ أَكْبَرُ)، بۆ تەواوکردنی سەد، جارێکیش بڵـێ: (لاإِلَهَ إِلاَّاللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَـــهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلىكُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، خـوای گـەورە لـە گوناهـەکانی خـۆش دەبـێ، هەرچەند وەکو کەفی دەریاش زۆربن. وە دە جار بڵێ: (لاإِلَهَ إِلاَّاللّٰهُ).

## ﴿ دوعاو سەلاوات لە دوای نوێژ ﴾

﴿عن فضالةﷺ: قال النَّبيُّﷺ لِرَجُل: إذا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ فَاحْمَدالله بِما هُوَ أَهْلُهُ وَصَلِّ عَلَيَّ، ثُم اُدْعُهُ﴾ رواه أبوداود والترمذي بسند حسن، واتە: هەر کاتێك نوێژت کرد، ئینجا دانیشتی، سوپاسی خوابکە: بەو جۆرەی لێ ی دەوەشێتەوە، ئینجا سەلاوات لە سەر من لێبدە، ئینجا دوعا بکە.

## ﴿ دەنگ هەڵێنان بەم زیکرانە ﴾

﴿ عن ابن عباس رضي الله عنهما: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ-حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ- كانَ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: دەنگ هەڵێنان بەم زیکرەی دوای نوێژە واجبەکان-کە خەڵك لە نوێژ دەبونەوە- لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبوو.

ئیمامی (الشافعي) دەفەرموێ: ئەگەر ئیمامی نوێژ بوو و دەیویست لێی فێرە زیکر بن، دەنگ هەڵدێنێ تا ئەزانێ لێ ی فێر بوون، ئینجا دەنگی نزم دەکاتەوە. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٢٦٠) ب(٣).

## ﴿ زیکری بە کۆمەڵ ﴾

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ إنَّ للّه مَلائكَةً سَيَّارةً فُضْلاً يَبْتَغُونَ مَجالسَ الذِّكْرِ، فَإذا وَجَدُوا مَجْلِساً فيه ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ، وَحَفَّ بَعْضُهُم بَعْضاً بِأَجْنحَتِهِمْ حتَّى يَمْلَئُوا مابَيْنَهُمْ وَبيْنَ السَّماءِ الدُّنْيا...﴾إلى أخر الحديث، رواه البخاري ومسلم واللفظ لە، واتە: خوای گەورە چەند فریشتەیەکی گەڕیدەی ڕێزداری هەنە، بە شوێن دانیشگەی زیکردا دەگەڕێن، هەر کاتێك دانیشگەیەکیان دەست کەوت: کە زیکری خوای تێدایە، ئەوانیش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا دادەنیشن‌و بە باڵەکانی خۆیان دەورە لە یەکتری دەدەن تا نێوان ئەو کۆمەڵەو نێوان ئاسمانی دونیا پڕ دەکەن.

ئەی لاوی موسوڵمان: لێرەدا تەنها مەبەستم ئەوە بوو: بەڵگە بێنمەوە: کە زیکرو سەلاوات‌و دوعای دوای نوێژو دەنگ هەڵێنان‌و زیکری بەکۆمەڵ، (بِدْعَة) نیە، بەڵکو سوننەتی پێغەمبەرەﷺ، ئەگینا: زیکرەکانی تری دوای نوێژ زۆرترن.

## ﴿ نوێژکردن بە پێڵاوەوە ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: لە چەند حەدیسی (صحیح)دا هاتوە: کە پێغەمبەرﷺ بە پێڵاوەوە نوێژی کردوەو بە پێخواسیش نوێژی کردوە. ئینجا هەر لە حەدیسی پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە: کە بۆ دروستبوونی نوێژ بە پێڵاوەوە، دوو مەرج پێویستن:

مەرجی یەكەم: ئەبی پێڵاوەكان پاك بن ﴿ عن سعیدﷺ قال: بَيْنَما رَسُولُ اللّهِﷺ يُصَلِّي بِأَصْحابِهِ إذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ..فَقَالَ إنَّ جِبْرِيلَ-عليه السلام-أَتانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيها قَذَراً ﴾ رواه ابوداود وأحمد والحاكم بسند صالح، واتە: پێغەمبەرﷺ نوێژی بە (جماعة) بۆ (صحابة)كان دەكرد، لە كاتێكدا كەوشەكانی داكەندن...ئینجا فەرمووی: جوبرائیل-علیه السلام- هاتە لامو پێی گوتم: كەوشەكان پیسییان پێوەیە.

كەوابوو: ئەی لاوی موسوڵمان: پێڵاوەكانی ئێستا گشتی پیسی پێوەیە، چونكە كۆڵانو ئاودەستخانەكانی ئێستا وەكو سەردەمی پێغەمبەرﷺ پاكو وشك نین، بەڵكو گشتی تەڕەو ئاوی پیسو تەڕایەتی پیسی لێ ئەپڕژێتە بنی پێڵاوەكە، كەوابوو: نوێژی پێوە دروست نیە.

مەرجی دووەم: ئەبی بنی پێڵاوەكە ئەوەندە نەرم بێ: وەك كەوشەكانی سەردەمی پێغەمبەرﷺ لە كاتی سوجدەدا بچەمێتەوە، تاكو زگی پەنجەكانی لە زەمین گیر ببێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: اَلْجَبْهَةِ، وَأَشارَ بِيَدِهِ عَلى أَنْفِهِ، وَالْيَدَيْنِ، وَالرِّجْلَيْنِ، وَأَطْرافِ الْقَدَمَيْنِ ﴾ رواه الشيخان واللفظ لمسلم، فەرمانم پێكراوە: لە سەر حەفت ئێسقان سوجدەببەم: نێوچاوان، ئامازەشی بۆ لوتی كرد، هەر دوو لەپەدەست، هەردوو ئەژنۆ، كۆتایی هەردوو قاچەكان، واتە: زگی پەنجەكان. بڕوانە (ارشاد الساری) ل(١٢٠) ب(٢).

ئەی لاوی موسوڵمان: كەوشەكانی سەردەمی پێغەمبەرﷺ بنیان نەرم بوو، سەرە پەنجەشیان تێدا دیار بوو، ئەتوانرا بە فەرمانی ئەم حەدیسە ڕەفتار بكرێو پەنجەكان لە زەمین گیر بكرێن، بەڵام پێڵاوەكانی ئێستا: وەك كلاشو پۆتینو قاڵتاغ، نوێژیان پێوە دروست نیە، چونكە لە سوجدەدا ناچەمێتەوەو ناگونجێ: زگی پەنجەكان لە زەمین گیر ببێ، وەك ئەوە وایە: قاچ لە ناو سندوقێكدا بێ، حەدیسەكەی سوجدە لە سەر حەفت ئێسقانەكانیش، شەرعزانانی هەر چوار مەزهەب ڕەفتاریان پێكردوە. بڕوانە (مقالات الكوثري) ل(١٧٨).

## ﴿ ئەندازەی نێوان هەر دوو قاچ لە نوێژدا ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: ئیمام (ابن حجرالهیتمی) ئەفەرموێ: سوننەتە نێوان هەر دو قاچەكان بە قەد بستێك بێ، بە پێچەوانەی فەرموودەی (أنوار)، كە دەفەرموێ: بە قەد چوار پەنجە. (تحفةالمحتاج) ل(٢١) ب(٢).

بەڵگە: ﴿ عن أبي هريرةﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ كانَ يَأْمُرُنا: إذا صَلّى أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ نَعْلَيْهِ بَيْنَ رِجْلَيْهِ ﴾ رواه ابوداود بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێكردین: هەر كاتێك یەكێكتان نوێژی كرد، با هەردوو كەوشەكانی لە نێوان هەردوو قاچەكانی دابنێ.

واتە: ئەگەر بڵێین: كەوشەكان لە تەنیشت یەكتری لە نێوان قاچەكان دادەندرێن، ئەوە نێوانەكە بستێك دەردەچێ: وەك فەرموودەكەی (ابن حجر)، وە ئەگەر بڵێین: كەوشەكان لە

سەر یەكتری دادەندرێن، ئەوە نێوانەكە چوار پەنجە دەردەچێ: وەك فەرموودەی (أنوار)، ئیتر نایەوێ: وەك زۆرانبازی قاچەكانی خۆی لەمە زیاتر لێك دوور بخاتەوە.

## ﴿ باسی (قَصْر)=كورتكردنەوەی نوێژ ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: هەر ڕێبوارێك سەفەرەكەی دوو قۆناغ، واتە: (٨٠)كیلۆمتر دور بێ، بۆی دروستە نوێژی چوار ڕەكعەتی كوردت بكاتەوە: بۆ دوو ڕەكعەتی، بەو مەرجانەی لە كتێبەكانی شەریعەتدا باسیان كراوە، بەڵام (إجماع)ی زانایانی هەر چوار مەزهەبی (أهل السنة) لە سەر ئەوەیە: (هەر سەفەرێك لە شەو و ڕۆژێك، واتە: لە دوو قۆناغ كەمتر بێ، دروست نیە (قصر) بكا، واتە: نوێژ كورت بكاتەوە بۆ دوو ڕەكعەت، ئەمەش بەڵگەكەیانە: ئیمامی(البخاری) لە (صحیح)ی خۆی دا لە سەردێڕێ ئەم باسەدا دەفەرموێ: ﴿ بابٌ فِي كَمْ تُقْصَرُالصَّلاةُ، وَسَمَّى النَّبيُّﷺ: يَوْماً وَلَيْلَةً سَفَراً، وكان ابن عمر وابن عباس-رضي الله عنهم- يَقْصُرانِ ويُفْطِرانِ فِي أَرْبَعَةِ بُرُدٍ وَهِيَ سِتَّةَ عَشَرَ فَرْسَخاً ﴾رواه البخاري هكذا معلقة بصيغه الجزم، ورواه البيهقي بسند صحيح موصولاً، ورواه ابن ابی شیبة بإسناد صحیح موقوفاً على ابن عباس-رضي الله عنه- بڕوانە (ارشاد الساری شرح البخاری) ل(٢٩١و٢٩٢) ب(٢).

واتە: ئەمە باس لەوە دەكا: ئایا لە ئەندازەی چەندا نوێژ كورت دەكرێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ شەو و ڕۆژێكی بە سەفەر ناو ناوە، (ابن عمر)و (إبن عباس) رضي الله عنهم—كە دوو (صحابة)ی پێغەمبەرنﷺ— لە ئەندازەی چوار (برید)، كە دەكاتە شانزە (فرسخ)، واتە: (٨٠)كم، نوێژیان كورت دەكردەوەو ڕۆژوویان نەدەگرت.

(إبن حجرالهیتمی) دەفەرموێ: نەزاندراوە هیچ (صحابة)یەك بە پێچەوانەی ئەم دوو (صحابة)یە ڕەفتاری كردبێ، جۆری ئەم ڕەفتارە شەرعیەش لەخۆیانەوە نەیانكردوە. —واتە: یان پێغەمبەریانﷺ دیتوە، یان گوێیان لێبووە وای كردوە— بڕوانە (تحفة المحتاج بحاشیة الشروانی) ل(٢٧٩) ب(٢).

## ﴿ ڕاستكردنەوەی هەڵەیەك ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: سەرەڕای ئەو بەڵگە بەهێزانەی ڕابردوو، دەبینی: چەند فەریكە خوێندەوارێكی ئەم سەردەمە، گەنجەكانمان لە ئایینی ئیسلام دوور دەخەنەوەو هەڵیاندەخەڵەتێنن: تاكو لە سەفەری زۆر كورتیشدا (قصر)بكەن—واتە: نوێژ كورت بكەنەوە— هۆیەكەشی ئەوەیە: لە چەند حەدیسێكی (صحیح)دا بە هەڵەدا چوون، بۆ نمونە: ﴿ عن أنسﷺ:كان رَسُولُ اللهِﷺ إذا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلاثَةِ أَمْيَالٍ أَوْ ثَلاثَةِ فَراسِخَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ ﴾ رواه مسلم، واتە: كە پێغەمبەرﷺ دەچووە سەفەر، سێ (میل)، یان چوار (فرسخ) دەرچوبا، نوێژەكەی دەكردەوە دوو ڕەكعەتی.

ئیمامی(النواوی) له شەرحی ئەم حەدیسەدا دەفەرموێ: ئەوە مەرج نیە کە سەفەرەکە تەنها ئەوەندە دوور بوبێ...ئینجا دەفەرموێ: بەڵکو پێغەمبەرﷺ بۆ سەفەر دەڕۆیشت پێش هاتنی کاتی نوێژ، ئینجا کە سێ (میل)، یان زیاتر دەڕۆیشت، کاتی نوێژ دەهاتو لەو کاتەدا نوێژەکەی بە کورتکراوەیی دەکرد. بۆیێ لە (المجموع)شدا دەفەرموێ: لە هیچ حەدیسێکدا بە ئاشکرایی نەهاتوە: کە لە ئەندازەی کەمتر لە دوو قۆناغ پێغەمبەرﷺ نوێژی کورت کردبێتەوە. بڕوانە (شرح مسلم) ل(٣٨٩و ٣٩٠) ب(٣) و(شرح المهذب) ل(٢١٦) ب(٤).

ئەی لاوی موسوڵمان: ئەگەر بیر لە (مَتْن)ی حەدیسەکە بکەیەوە، ڕاستی ی فەرموودەکەی ئیمامی(النواوی)ت بۆ دەردەکەوێو دەزانی: کە سەفەرەکە ئەوەندە کورت نەبوە، چونکە لە (مَتْن)ی حەدیسەکەدا ووشەی (إذَا خَرَجَ) بەکار هاتوە، واتە: هەر کاتێك دەچووە دەرەوە، نەك ووشەی (إذا سافَرَ) هەر کاتێك دەچووە سەفەر.

## ﴿ باسی ( جَمْع ) کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە یەك کاتدا ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: هەر سەفەرێك (٨٠)هەشتا کیلۆمەتر دوور بێ، دروستە: نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ عەسر، هەم مەغریب لەگەڵ عیشا، لە یەك کاتدا کۆ بکرێنەوە، بەو جۆرەی لە کتێبەکانی شەریعەتدا باس کراوە، بەڵام کۆکردنەوەی دوو نوێژ بۆ کەسێك کە لە سەفەردا نەبێ–بێ‌هیچ هۆیەك– لە مەزهەبەکانی (أهل السنة)دا نیە، بەڵکو مەزهەبی (شیعه)یە، بڕوانە (الفقه علی المذاهب الخمسة) ل(٩١).

ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: مەزهەبی (شافعی)و (حنفی)و (مالك)و (أحمد)و کۆمەڵی هەرە زۆری زانایان ئەمەیە: دروست نیە دوو نوێژ لە یەك کاتدا لە ماڵەوە کۆ بکرێنەوە، بێ ترسو بارانو نەخۆشیو سەفەر. بڕوانە (المجموع شرح المهذب) ل(٢٦٩) ب(٤).

پرسیار: ئایا دەربارەی ئەم حەدیسە وەڵام چی یە؟: ﴿ عن ابن عباس رضی الله عنهما: جَمَعَ النَّبِيُّﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشاءِ، بِالْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ، وفي رواية: وَلا سَفَرٍ ﴾ رواه مسلم، واتە: پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی لەگەڵ عەسر، هەم مەغریب لەگەڵ عیشای لە (مدینة)دا بە یەکەوە کۆ کردنەوە، بێ ترس هەبوونو بێ بارانو سەفەر؟.

**وەڵام:** ڕاستە (سند)ی ئەم حەدیسە(صحیح)ە، بەڵام زانایانی هەر چوار مەزهەبی (أهل السنة)و کۆمەڵی گەورەی زانایان ڕەفتاریان بەم حەدیسە نەکردوە؟ چونکە دوو جۆرە گومان لە (مَتْن)ی ئەم حەدیسەدا ڕوو دەدا:

**یەکەم:**– (راوی) حەدەیسەکە لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ أَظُنُّهُ أَخَّرَ الظُّهْرَ وَعَجَّلَ الْعَصْرَ وَأَخَّرَ الْمَغْرِبَ وَعَجَّلَ الْعِشاءَ ﴾رواه مسلم هکذا، والنسائي جزماً، واتە:

وا تێدەگەم: نوێژی نیوەڕۆی نەختێك دواخستو عەسریشی نەختێك زوتر كرد، مەغریبی نـەختێك دواخـستو عیـشاشی نـەختێك زوتـر كـرد. واتـە: مەبەسـت بـە (جمـع) لـەم حەدیسانەدا: ئەم دواخستنو زووكردنەیە.

**دووەم:** (عَـدَمُ التَّعْـيِين)=دیاری‌نـەكردنی (جمـع)، هـەر وەك (الـصنعانی) دەفـەرموێ: (جمع)كردنی نوێژ لەماڵەوە دروست نیە...ئەم حەدیسەش دروست نیە بكرێتـە بەڵگـە، چونكە دیاری نەكردوە: (جمع التقدیم)ی مەبەستە، یان (جمع التأخیر)، وە دیاری‌كردنی یەكێك لەم دوو مەبەستانە، خۆسەپاندنێكی بێ‌بەڵگەیە...ئینجا ئەویش هەر ئەو واتەیەی دیاری كردوە: كە مەبەست دواخستنی نوێژی یەكەمەو زووكردنی نوێژی دووەمە. بڕوانـە (سبل السلام) ل(٤٣) ب(٢).

## ﴿ نوێژی ( جُمْعَه ) لە چۆڵو بیاباندا ﴾

ئیمامی(النواوی) لە (المجموع)دا دەفەرموێ: نوێژی (جمعة) لە هیچ شوێنێك دروست نیە، تەنها لە ناو خانووەكانی ئەو كەسانە نەبێ: كە تێیدا نیشتەجێ دەبن: جا شار بێ، یـان دێ بێ، چونكە نە لە سەردەمی پێغەمبەرو ﷺ نە لە سەردەمی هـەر چـوار خەلیفەكانـدا، جومعە نەكراوە، تەنها لە ناو شار، یان لە ناو دێ نەبێ، لە هیچ حەدیسێكدا نەهاتوە: كە جومعە لە چۆل و بیاباندا كرابێ، جا ئەگـەر دانیـشتووانی شـار چـوونە دەرەوەی شـارو نوێژی جومعەیان لە دەرەوە كرد، ئەم نوێژە دروست نیە. بڕوانە (شرح المهذب) ل(٣٧٠) ب(٤) و(تحفه المحتاج) ل(٤٢٣)ب (٢).

ئەی لاوی موسوڵمان: هەر بۆ ڕوونكردنەوەی فەرموودەی ئیمامی (النواوی) دەڵێین: هەر كاتێك ڕووی دابێ، پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی هـەینی لـە ئاوەدانی‌دا نـەبوبێ: جـا لـە چـۆڵو بیابان، یان لـە دەرەوەی شـار بوبـێ، ئـەوە نوێـژی (جمعـة)ی نـەكردوە، بـەڵكو نوێـژی نیـوەڕۆی كـردوە ﴿ عن جابرﷺ فی حدیث حَجَّة الوداع...أَتَى رَسُولُ اللهِﷺ عَرَفَةَ... فَخَطَبَ النَّاسَ...ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصلَّىالْعَـصْرَ ﴾رواه مـسلم وابوداود، واتە: پێغەمبەرﷺ هاتە خـاكی (عرفـة)، ئینجـا وتـاری بـۆ خەڵكەكـە دا، ئینجـا بانگدەر بانگی دا، ئینجا ئیقامەتی نوێژی كرد، جـا پێغەمبـەرﷺ نوێـژی نیـوەڕۆی كـرد، ئینجا جارێكی تریش ئیقامەتی كردو نوێـژی عەسریـشی بـە (جمـع التقـدیم) كـرد. واتـە: نوێژی (جمعة)ی لە (عَرَفَة) نەكرد، چونكە دەرەوەی شاری (مكة) بوو و ئـاوەدانی نـەبو، شتێكی ئاشكراشە: ڕۆژی (عرفة)ی(حجة الوداع) ڕێكەوتی ڕۆژی هەینی بوو.

ئـەی لاوی موسـوڵمان: جگـە لـەم بەڵگەیـەش: چـەند بەڵگـەی تـری بـەهێز هەنـە: كـە پێغەمبەرﷺ هەر بەخۆی لە (٢٧) بیستو حەفت غەزادا چووەتە دەرەوە، زۆریشی

ڕێکەوتی ڕۆژی هەینی بووەو جەنگیش ڕووی نەداوە، نوێژی جومعەشی نەکردوە.
جا نازانم: سەرەڕای ئەم هەموو بەڵگە بەهێزانە، ئەو فەریکە خوێندەوارانەی (دۆی دادەیان لێ ڕژاوە)، بە کام بەڵگە ڕەفتار دەکەن و گەنجەکانمان گومڕا دەکەن و لە ڕۆژی هەینی دا بۆ سەیران دەیانبەنە دەرەوەی شار، هەر لەوێش نوێژی (جمعة)یان پێدەکەن؟ خۆ ئەگەر نوێژی نیوەڕۆش بکەن، دیسان چوونە دەرەوە لە ڕۆژی هەینیدا -بۆ شوێنێك: کە (جمعه)ی لێ نەکرێ- هەر حەرامە. بڕوانە(تحفه المحتاج) ل(٤١٥) ب(٢).

## ﴿ سوننەتی پێش جومعە ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: لە پێش نوێژی(جمعة)دا: دوو ڕەکعەت، یان چوار ڕەکعەت سوننەت هەنە، ئەمەش بەڵگەکانە:

١-پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ بَيْنَ كُلِّ أذانَيْنِ صَلاَةٌ، ثُمَّ قالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شـــاءَ ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: لە نێوان هەر بانگو ئیقامەتێکدا نوێژێکی سوننەت هەیە، سێ جار وای فەرموو، ئینجا لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ ئەوکەسەی حەز ئەکا.

واتە: مەبەست بە (أذانَيْن) هەردوو بانگەکەی (جمعة) نیە، بەڵکو مەبەست بانگو ئیقامەیە، کەواتە: ئەم حەدیسە-جگە لە (جمعة)- نوێژی (مغرب)و (عیشا)ش دەگرێتەوە، هەروەك لە حەدیسی دووەمدا:

٢-پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ ما مِنْ صَلاةٍ مَفْرُوضَةٍ إلاّ وَبَيْنَ يَدَيْهَا رَكْعَتانِ ] رواه ابن حبان و صححه، گشت نوێژێکی واجب دوو ڕەکعەت سوننەتی لە پێشدا هەیە. واتە: (جمعه)ش نوێژێکی واجبە، کەوابوو: دووڕەکعەتیشی لە پێشدا هەیە، بڕوانە (ارشاد الساری شرح البخاری) ل(١٥و١٩٣) ب(٢).

٣-﴿ عن عبدالله بن مسعودﷺ: أَنَّهُ كانَ يُصَلّي قَبْلَ الْجُمُعَةِ أَرْبَعاً وَبَعْدها أَرْبَعاً، وَكانَ يَأْمُرُ بِها ﴾رواه عبدالرزاق بسند صحيح والترمذي، قال الدكتور هاشم: وهو اثر في غاية الصحة، واتە: (إبن مسعودﷺ) چوار ڕەکعەتی لە پێش جومعەدا ئەکردو چواریشی لە دوای جومعەدا ئەکرد، فەرمانیشی بە خەڵکی ئەکرد: کە وا بکەن. هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسانە، ئیمامی (النواوی) ئەفەرموێ: لە پێش نوێژی جومعەدا ئەو دوو جۆرە سوننەتە هەنە: کە لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا هەنە، واتە: دوو ڕەکعەت، یان چوار ڕەکعەت. بڕوانە (تحفةالمحتاج) ل(٢٢٤) ب(٢)و (الفقه المقارن) ل(١٥٤) و(البدعة) ل(١١٣).

## ﴿ زیکرو دوعای ( مُصافَحَة )=تۆقەکردن ﴾

١-سوپاسی خواو دوعای لێخۆشبون، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ﴿ إذا الْتَقَى الْمُـــسْلِمانِ

فَتَصافَحا وَحَمِدااللّهَ واستَغْفراهُ غُفِرَ لَهُما ﴾رواه أبوداود بسند صالح، واته: هەر كاتێك دوو موسوڵمان بە یەكتری گەیشتن، جا (مصافحة)=تۆقەیان كردو سوپاسی خوایان كردو گوتیان: (الحمد لله)و گوتیان خوا لێمان خۆش بێ، ئەوە خوا لێیان خۆش ئەبێ.
٢-سەلاوات لێدان، (إبن حجرالهیتمی) ئەفەرموێ: لە حەدیسێكدا هاتوە: ﴿ ما منْ مُسْلمَیْنِ یَلْتَقیانِ فَیَتَصافَحانِ وَیُصَلّیانِ عَلی النّبيِّ ﷺ إلاّ لَمْ یَتَفرّقا حَتّی یُغْفَر لَهُما ذُنُوبُهُما... ﴾ أخرجه الحسن بن سفیان وابویعلي وابن حبان في الضعفاء، وابن بشكوال، واتە: هەردوو موسوڵمانێك: كە دەگەنە یەكتری، تۆقە بكەن‌و سەلاوات لە سەر پێغەمبەر ﷺ لێ بدەن، لێك جیانابنەوە تا لە گوناهەكانیان دەبوردرێ. بڕوانە (الفتاوی‌الفقهیة) ل(١٨٧) ب(١).

## ﴿ باوەش لێك وەرهێنان‌و یەكتر ماچكردن ﴾

(الشروانی) لە (مغنی) دەگێڕێتەوە: سوننەتە پیاو بە یەكەوە تۆقە بكەن، ئافرەتیش بە یەكەوە تۆقە بكە...

ئینجا دەفەرموێ: (مكروه)=ناپەسندە: باوەش لێك وەربێنن‌و سەر، یان ڕووی یەكتری ماچ بكەن هەرچەند ماچكەر، یان ماچ لێكراو مرۆڤی باشیش بن، بەڵام: بۆ ئەو ڕێبوارەی لە سەفەر گەڕاوەتەوە، یان ماوەیەكی زۆر یەكترییان نەدیتبو، ئەوە ماچكردن‌و باوەش لێك وەرهێنان هەردووكی سوننەتە. بڕوانە (حاشیة الشروانی) ل(٢٠٨) ب(٧).

١-بەڵگەی (مكروه)=ناپەسندی ماچكردن: ﴿ قالَ رَجُلٌ: یارَسُولَ اللّهِ ﷺ اَلرَّجُلُ مِنّا یَلْقی أخاهُ أَوْ صَدیقَهُ أَیَنْحَنی لَهُ؟ قالَ: لا، قالَ: أَفَیَلْتَزِمُهُ وَیُقَبِّلُهُ؟ قال: لا، قالَ: أَفَیَأْخُذُ بِیَدِهِ وَیُصافِحُهُ؟ قالَ: نَعَمْ ﴾رواه الترمذي بسند حسن، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤ دەگاتە برای خۆی، یان دۆستی خۆی، ئایا سەری بۆ بچەمێنێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نا. گوتی: باوەشی لێ وەربێنێ‌و ماچی بكا؟ فەرمووی: نا. گوتی: دەستی بگرێ‌و تۆقەی لەگەڵ بكا؟ فەرمووی: بەڵێ. واتە: لەم حەدیسەدا مەبەست بە یەكگەیشتنی ڕۆژانەیە، تاكو ئەم حەدیسە دژایەتی نەبێ: لەگەڵ ئەم حەدیسانەی داهاتوو:

٢-بەڵگەی ماچكردنی ڕێبواری گەڕاوە لە سەفەر: ﴿ قَدمَ زَیْدُ بن حارِثَةَ اَلْمَدینَةَ فَأَتی النَّبيَّ ﷺ فَقَرَعَ الْبابَ فَقامَ إِلَیْهِ النَّبيُّ ﷺ فَاعْتَنَقَهُ وَقَبَّلَهُ ﴾رواه الترمذي بسند حسن، واتە: (زَیْد) هاتەوە (مَدینة)، ئینجا هاتەماڵی پێغەمبەر ﷺ لە دەرگەی‌دا، پێغەمبەر ﷺ بۆی هەڵساو ماچی كرد.

هەم ﴿ وَلَمّا قَدمَ جَعْفرُ بنُ أبي طالب منَ الْحَبَشَة: تَلَقّاهُ النَّبيُّ ﷺ فَالْتَزَمَهُ وَقَبَّلَ مابَیْنَ عَیْنَیْهِ ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، واتە: لەو كاتەی (جعفر) لە (حبشة) گەڕاوە، پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لێكردو باوەشی لێ وەرهێناو نێوچاوانی ماچ كرد.

## ﴿ دەست ماچکردن ﴾

(إبن حجرالهيتمي) دەفەرموێ: سوننەتە دەستی پیاوی چاك و پیاوی زاناو پیاوی ڕێزدار ماچ بكا، چونكە حەزرەتی(أبوعبيدة) دەستی ئیمامی(عمر)ی ماچ كردوه.رضي الله عنهما (تحفة المحتاج) ل(٢٢٩) ب(٩).

بەڵگە: ﴿ عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قَبَّلْنا يَدَ النَّبِيِّ ﷺ ﴾رواه البخاري في الأدب المفرد وأبوداود بسند حسن، (ابن عمر) فەرمووی: ئێمە دەستی پێغەمبەرمانﷺ ماچ كرد.

هەروەها: ﴿ عن زارعﷺ وَكانَ في وَفْد عَبْدالْقَيْس: لَمَّا قَدمْنا الْمَدينَةَ فَجَعَلْنا نَتَبادَرُ منْ رَواحلنا فَنُقَبِّلُ يَدَ رَسُولِ اللهِﷺ وَرِجْلَهُ ﴾رواه ابوداود والترمذي بسند صحيح، واتە: كە ئێمە -نوێنەری(عبدالقيس)- هاتینە (مدینە)ی پیرۆز، بە پەلە لە وڵاغەكانمان دادەبەزین و دەست و قاچی پێغەمبەرمان ماچ دەكرد.

## ﴿ هەڵسان لە بەر یەكتری بۆ ڕێزلێنان ﴾

ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ: چینی (سلف) بەردەوام بوون لە سەر ئەم ڕەفتارە: بۆ ڕێزلێنان لە بەر ئەو كەسە هەڵدەستان: كە دەهاتە لایان. بڕوانە (شرح المهذب) ل(٤٧٦) ب(٤).

بەڵگە -جگە لەحەدیسەكانی ڕابردوو-: ﴿ عن عائشة-رضي الله عنها: كانَتْ فاطمةُ-كرم الله وجهها-إذا دَخَلَتْ عَلَى النَّبيِّﷺ قامَ إلَيْها فَأَخَذَ بِيَدها فَقَبَّلَها وَأَجْلَسَها في مَجْلسه وَإذا دَخَلَ النَّبيُّﷺ عَلَيْها قامَتْ إلَيْه فَأَخَذَتْ بِيَده وَقَبَّلَتْهُ وَأَجْلَسَتْهُ في مَجْلسها ﴾رواه ابوداود والنسائي والترمذي بسندحسن، كاتێ حەزرەتی(فاطمة)ی كیژی پێغەمبەرﷺ دەچووە لای پێغەمبەرﷺ پێغەمبەرﷺ لە بەری هەڵدەستاو دەستی دەگرت و نێوچاوانی ماچ دەكردو لە شوێنی خۆی دایدەنیشاند، هەروەهاش كە پێغەمبەرﷺ دەچووە لای (فاطمة) رضي الله عنها، ئەویش لە بەری هەڵدەستاو دەستی دەگرت و ماچی دەكردو لە شوێنی خۆی دایدەنیشاند.

هەروەها: ﴿ عن أبيسعيدﷺ جاءَ سَعْدُ بنُ مُعاذﷺ فَقالَ النَّبيُّﷺ للأَنْصار: قُومُوا إلى سَيِّدكُمْ ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: (سَعْد) هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پێغەمبەریشﷺ فەرمانی كردە (أنصار)یەكان و فەرمووی: لە بەر گەورەی خۆتان هەڵسن.

هەروەها: ﴿ عن كعب بن مالكﷺ في قصَّة تَوْبَته: دَخَلْتُ الْمَسْجدَ فَإذا رَسُولُ اللهِﷺ جالسٌ حَوْلَهُ النّاسُ، فَقامَ طَلْحَةُﷺ يُهَرْوِلُ حَتَّى صافَحَني وَهَنَّأَني، فَكانَ كَعْبُ لا يَنْساها لطَلْحَةَ ﴾رواه البخاري ومسلم، (كَعْب) دەفەرموێ: كە تۆبەم لێ قبوڵ كرا، چوومە مزگەوت، پێغەمبەرﷺ (صحابە)ی لە دەوروە دانیشتبون، (طَلْحَة) لە بەرم هەڵساو ڕای كرد: تا هات تۆقەی لەگەڵ كردم و پیرۆزبایی لێ كردم، ئینجا (كَعْب) ئەم چاكەیەی (طَلْحَة)ی لە بیر نەدەچوو.

## ﴿ ڕوونکردنەوەیەك ﴾

ئەی لاوی موسوڵمان: سەرەڕای ئەو حەدیسە(صحیحە)ی باسمان کردن، چەند کەسێك بەهەڵەدا چووەو دەڵێ: هەڵسان لە بەر یەکتری حەرامەو (بدعة)یە، بەڵگەش بەم حەدیسانە دێنێتەوە:

١-پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتمثَّلَ لَهُ الرِّجَالُ قِياماً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدهُ مِنَ النَّارِ﴾ رواه الترمذي وابوداود بسند حسن، هەر کەسێك پێی خۆش بێ: پیاو لە بەردەستی ڕابوەستن، با جێگەی خۆی لە ئاگر ئامادە بکا.

**وەڵام:** هەر بە ئاشکرایی دیارە ئەم حەدیسە باسی لە بەر هەڵسان ناکا، چونکە ڕستەی (يَتمثَّلَ لَهُ الرِّجالُ قِيامـــاً) واتە: بەخۆی دانیشێ‌و پیاوەکانیش بە پێوە لە خزمەتی ڕابوەستن. هەروەك ئیمامی(البیهقی) ئاماژەی بۆ کردوە، کەوابوو: لەبەر هەڵسان‌و بە پێوە ڕاوەستان دوو مەسەلەی لێك جیاوازن. بڕوانە (تحفةالمحتاج) ل(٢٢٩) ب(٩).

٢- ﴿ عن أَنس‌رضي الله عنه: لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّﷺ وَكانُوا إِذا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا لما يَعْلَمُونَ مِنْ كَراهِيَّتِه لذلكَ ﴾رواه الترمذي بسند صحيح، (صحابة) هیچ کەسێکیان لە پێغەمبەرﷺ لە لا خۆشەویستتر نەبو، کە دەیاندیت لە بەری هەڵنەدەستان، چونکە دەیانزانی پێی ناخۆشە.

**وەڵام:** ئەم حەدیسە وا ناگەیەنێ کە لە بەر هەڵسان حەرام بێ، چونکە وشەی (كَراهِيَّـة) واتەی جیایە لەگەڵ (حَرام)، کەواتە: پێغەمبەرﷺ لەبەر هەڵسانی (حَرام) نەکردوە، بەڵکو تەنها بۆخۆی پێی ناخۆش بووە، لە بەر زێدە ملکەچی، نەوەك لە پلەی خۆی زیاتر بەرز بکرێتەوە. بڕوانە (غاية المأمول شرح التاج الجامع للاصول) ل(٢٥٥) ب(٥).

(إبن حجرالهيتمى) بە بەڵگەی حەدیسەکانیڕابردوو دەفەرموێ: لە بەر هەڵسان سوننەتە: بە هۆی پیاوچاکی و زانست‌و زاوزێ یی‌و کاربەدەستی خۆپارێز لە بێ شەرعی.- (إبن عبدالسلام) دەفەرموێ-: یان چاوەڕوانی چاکەی لێ بکرێ، یان لە خراپەکاری ی بترسێ، هەرچەند ئەوەی لێ ی دەترسێ، (کافر)ش بێ‌و لێ ی بترسێ زیانێکی گەورەی لێ بدا، جا دەبێ لە بەر هەڵسان لە ڕووی چاکەو ڕێزلێنان بێ. بڕوانە (تحفة المحتاج) ل(٢٢٩) ب(٩).

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ إنَّ مِنْ إجْلالِ اللهِ-تَعالى-: إِكـــرامَ ذى الشَّيْبَةِالْمُـــسْلِمِ، وَحامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِالْغالِي فِيهِ والْجافِي عَنْهُ، وَإِكْرامَ ذى الـــسُّلطانِ الْمُقْـــسِطِ ﴾رواه ابوداود بسند حسن، بە ڕاستی بەشێك لە بە گەورە ناسینی خوا ئەوەیە: ڕێز لە پیری ڕیش سپی ی موسوڵمان بندرێ، ڕێز لەو قوڕئان خوێنە بندرێ: کە لە سنوری قوڕئان دەرناچێ‌ولە

(متشابهات) ناكۆڵێتەوەو لە خۆێندنیشی دوور ناكەوێتـەوە، هـەم ڕێـز لـە كاربەدەسـتی دادپەروەر بندرێ.

كەوابوو: پێویستە لە دەست ماچكردنو لەبەرهەڵسانو خواردنو خواردنەوەو دەست پێكردنـی ڕاسـتەو ڕۆیـشتنی ڕێگـەو...هتـد، ئـەم ڕێزلێنانـە ڕەچـاو بكـرێ، هـەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ أَنْزِلُواالنّاسَ مَنَازِلَهُمْ ﴾رواه مسلم وابوداود، ئەم خەڵكە پلەی خۆیان بدەنێ. واتە: بە قەد پلەی خۆیان ڕێزیان لێ بنێن...كۆتایی.

منیش بەندەی گوناهبار: (عبـدالله عبـدالعزیز هەرتـەلی)، شـوكری خـوا دەكـەمو دەڵێم: أحمدك اللهم على نعمك وآلائك وأصلي وأسلم على سيّدنا محمد خـاتم أنبيائـك وعلـى آلـه واصحابه الى يوم لقائك. رب اغفر لي وَلوالديّ وَارحمْهُما كما رَبياني صغيرا. سـوپاس بـۆ تـۆ ئەی خودایە: كە یارمەتیت دام پەڕتوكی (چـەند گوڵێـك لـە گـوڵزاری ئیـسلام) بكـەم بـە چەپكە گوڵو (پێشكەش بە گەنجی نەونەمام)ی بكەم، خودایە لە خـۆمو دایـكو بـاوكمو خۆشەویستانم خۆش ببەو بە گوڵو گوڵزاری بەهەشت شـادمان بكـەو بـە دیتنـی خـۆتو پێغەمبەرت (محمدﷺ) دڵخۆشمان بكە، آمین.

تـەواو بـوو لـە شـەوی سێشـەممە (٢٩)ی ذیالحجـەی (١٤١٧) كۆچـی، بەرامبـەر (٦)ی ئایاری (١٩٩٧)ی زایینی، لە شاری هەولێر– لە كوردستان.

وَصَلى الله وَسَلّم عَلَى سَيّدنا محمد وآله وَصحبه اجمعين، وَالْحَمْدُ لله رَبّ العالَمين، وَلا حولَ وَلا قوة إلاّ بالله العلي العظيم، وَحسْبُنا الله وَنِعمَ الوكيل.

**عبدالله عبدالعزیز هـەرتەلی**

**هەولێر–كوردستان**

(٢٩)ی ذیالحجة–١٤١٧–كۆچی

(١٦)ی گـوڵان–٢٦٩٧–كـوردی

(٦)ی ئـایـار–١٩٩٧–زایـیـنـــی

# ناوەڕۆکی گوڵزاری ئیسلام